# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كِتَابُ التَّوْبَةِ

تأليف

أبي بكر عبد الله بن محمّد بن عبيد بن سُفيان
القرشي المعروف بابن أبي الدنيا
(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێرانی :
مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردی

# موسوعة ابن أبي الدنيا

## كِتَابُ التَّوْبَةِ

تأليف

أبي بكر عبد الله بن محمد بن عبيد بن سفيان
القرشي المعروف بابن أبي الدنيا

(٢٠٨ - ٢٨١هـ)

وەرگێڕانی:

مَوسُوعَةُ إبْنِ أَبِي الدُّنيَا به كوردی

# كتاب التوبة

١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا يوسف بن موسى، حدثنا حسين بن علي الجعفي، عن القاسم بن الوليد الهمداني قال : سألت قتادة عن قوله : ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ (البَقَرَة : ١٦٨) .

قال : (كل معصية الله فهي من خطوات الشيطان) .

١ - القاسم بن الوليد الهمداني ئەڵێ: پرسیارم کرد لە قتادة دەربارەی فەرمایشتی: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ (البَقَرَة : ١٦٨) .

وتی : (هەموو سەرپێچییەکی الله لە هەنگاوەکانی شەیطانە) .

٢ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا محمد بن عبد الله الأرزي، حدثنا حجاج الأعور، عن مبارك، عن الحسن قال : (إذا رأيت في ولدك ما تكره فاعتب الله فإنما هو شيء يراد به أنت ).

٢ - الحسن البصري ئەڵێ : (کاتێک شتێکت بینی لە منداڵەکەتدا کە ڕقت لێی بووەوە ڕوو بکە الله چونکە ئەوە شتێکە مەبەست لێی تۆی) .

: واته خراپەیەک لە منداڵەکەت هەبێت ئەوە تاوانی خۆتە دێتەوە ڕێت بۆیە تەوبەی لێ بکە، الله أعلم.

٤ - **قال ابن أبي الدنيا** : حدثني سويد بن سعيد، حدثنا علي بن مسهر، عن يوسف بن ميمون، عن عطاء، عن عائشة قالت : قال رسول الله ﷺ : (من سره أن يسبق الدائب المجتهد فليكف عن الذنوب) .

٤ - رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (هەرکەس پێی خۆشە پێشی کەسێکی تێکۆشەر بکەوێت با دەست هەڵبگرێت لە تاوان) .

: تێکۆشەر واتە کەسێک زۆر کۆشش بکات لە عیبادەتەکاندا و زۆر جددی بێت، الله أعلم.

٥ - **قال ابن أبي الدنيا** : حدثني أبو حفص البخاري، أنه حدث عن محمد بن عبد الله ابن علاثة، عن إبراهيم بن أبي عبلة قال : (دخلت على عمر بن عبد العزيز وهو في مسجد داره، وكنت له ناصحاً وكان مني مستمعاً .

فقال : يا إبراهيم، بلغني أن موسى قال : إلهي، ما الذي يخلصني من عقابك، ويبلغني رضوانك، وينجيني من سخطك ؟

قال : الاستغفار باللسان، والندم بالقلب، والترك بالجوارح) .

٥ - إبراهيم بن أبي عبلة ئەڵێ : (چوومە لای عمر بن عبدالعزيز كە لە مزگەوتدا بوو، وە من ئامۆژگاریم ئەكرد و ئەویش گوێی بۆ من گرتبوو، وتی : ئەی إبراهيم پێم گەشتووە كە موسى فەرموویەتی: ئەی پەروەردگار چیە ئەوەی كە ڕزگارم ئەكات لە سزاكەت، وە ئەمگەیەنێت بە ڕازی بوونت، وە ڕزگارم ئەكات لە تورەییت ؟

فەرمووی : داوای لێخۆش بوون كردن بە زمان، پەشیمان بوونەوە بە دڵ، وە وازهێنان - لە تاوان - بە لاشە ) .

٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **وحدثني أبو حفص، حدثنا سعيد بن أشعث بن سعيد، أخبرني الحارث بن عبيد الإيادي، عن ثابت البناني، عن معاوية بن قرة قال** : قال علي بن أبي طالب : (إني لأرجو أن تكون توبة العبد من ذنبه ندامته عليه ) .

٦ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (هیوادارم تەوبەكردنی بەندە لە تاوانەكەی پەشیمانبوونەوەكەی بێت لێی ) .

١٣ - **قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثت عن عقبة بن مكرم العمي، حدثنا محمد بن أبي عدي** عن الأشعث قال : (دخلت السجن فإذا الفرزدق في السجن وإذا هو يقرض شعرا، فقال : إني لقيت أبا هريرة فقال : يا فرزدق إني أراك صغير القدمين، فالتمس لهما موضعا عند الحوض .

فقلت : إني قد عملت كذا وعملت كذا .

فقال: إن التوبة لا تزال تقبل ما لم تطلع الشمس من مغربها، عمل عبد ما عمل من شيء).

١٣ - الأشعث ئەڵێ : (چوومە سجنەوە الفرزدق لە سجن بوو و شیعرێکی دارشت، وتی: من گەشتووم بە أبا هريرة فەرمووی : ئەی فرزدق ئەبینم قاچەکانت بچووکن، لە لای حەوز لە شوێنێکدا دایان بنێ .

وتم : من ئەمەم کردووە و ئەوەم کردووە .

فەرمووی : تەوبە بەردەوام قبوڵ ئەکرێت مادام خۆر لە خۆرئاوایەوە هەڵنەیەت، بەندە هەر کردەوەیەکیشی کرد بێت لە کردەوەکان) .

١٤ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا أبو خيثمة، حدثنا جرير، عن الأعمش، عن عمارة بن عمير، عن الحارث بن سويد قال : دخلت على عبد الله أعوده وهو مريض، فحدثنا بحديثين؛ حديث عن نفسه، وحديث عن رسول الله ﷺ قال : (إن المؤمن يرى ذنوبه كأنه في أصل جبل يخاف أن يقع عليه، وإن الفاجر يرى ذنوبه مثل ذباب على أنفه فذبه عنه) .

قال : وسمعت رسول الله ﷺ يقول : (الله أشد فرحاً بتوبة عبده المؤمن من رجل في أرض دوية مهلكة، معه راحلته عليها طعامه وشرابه، فنام فاستيقظ وقد ذهبت، فقام يطلبها فطلبها حتى أدركه العطش .

ثم قال : أرجع إلى مكاني الذي كنت فيه حتى أموت .

قال: فوضع يده على ساعده ليموت فاستيقظ وعنده راحلته عليها زاده وطعامه وشرابه؛ فالله أشد فرحاً بتوبة عبده من هذا براحلته وزاده).

**١٤** - الحارث بن سويد ئەڵێ: (چوومە لای عبدالله - **ابن مسعود رضي الله عنه** - بۆ سەردانی کردنی نەخۆش بوو، دوو فەرموودەی بۆ گێڕاینەوە، فەرموودەیەکیان لە خۆیەوە، فەرموودەکەی تریان لە رسول الله ـەوە ﷺ، فەرمووی: (ئیماندار سەیری تاوانەکانی ئەکات وەک ئەوەی لە بنی شاخێکەوە بێت ئەترسێت لەوەی بکەوێت بەسەریدا، وە فاجر سەیری تاوانەکانی ئەکات وەک ئەوەی مێشێک لەسەر لووتی بێت و دەری بکات.

وە فەرمووی گوێم لە رسول الله ﷺ بووە کە فەرموویەتی: (الله خۆشحاڵترە بە تەوبەی بەندە ئیماندارەکەی لە پیاوێک کە بە هیلاکیەوە لە زەویەکدایە، سواریەکەی لەگەڵە کە خواردن و خواردنەوەی لەسەرە، ئەخەوێت وە هەڵئەستێ ئەبینێت ڕۆشتووە، هەڵئەستێ و بەدوای ئەکەوێت تا تینووی ئەبێت، دواتر ئەڵێت ئەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی بووم هەتا ئەمرم، دەستی دائەنێت لەسەر مەچەکی تا بمرێت، خەبەری ئەبێتەوە سوارەکەی لەلایەتی کە توێشوو و خواردن و خواردنەوەکەی لەسەر بوو، الله زیاتر خۆشحاڵە بە تەوبەی بەندەکەی وەک لەو پیاوە بە سواریەکەی و توێشووەکەی).

**١٥** - **قال إبن أبي الدنيا**: حدثنا أبو خيثمة، حدثنا يحيى بن سعيد، عن التيمي، عن أبي عثمان، عن ابن مسعود أن رجلاً أصاب من امرأة قبلة فأتى النبي ﷺ يسأله عن

كفارتها، فنزلت هذه الآية : ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ (هود : ١١٤) .

فقال : يا رسول الله، ألي هذه الآية ؟

قال : (ولمن عمل بها من أمتي) .

١٥ - له ابن مسعود ەوە كە پیاوێک تووشی شتێک بوو لەگەڵ خێزانیا هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد دەربارەی کەفارەتەکەی، ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ﴾ (هود : ١١٤) .

وتی : ئەی رسول الله ئەم ئایەتە بۆ منە ؟

فەرمووی : (بۆ هەر کەسێک لە ئوممەتەکەم کە ئەنجامی بدات) .

١٦ - **قال إبن أبي الدنيا** : **حدثنا أبو خيثمة، حدثنا جرير، عن يحيى الجابر، عن أبي ماجد عن عبد الله** أنه أنشأ يحدث أن أول رجل قطع في المسلمين - أو من المسلمين - رجل من الأنصار أتي به رسول الله ﷺ فقيل : سرق .

فقال : (اذهبوا بصاحبكم فاقطعوه) .

وكأنها أسف وجه رسول الله ﷺ رمادا ، فقال له بعض جلسائه : كأن هذا قد شق عليك يا نبي الله ؟

قال : (وما يمنعني أن تكونوا أعواناً للشيطان أو لإبليس، إنه لا ينبغي لوالي أمر أن يؤتى بحد إلا أقامه، والله عفو يحب العفو) .

ثم قرأ هذه الآية : ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور : ٢٢) .

١٦ - له عبدالله ـەوە - ابن مسعود رضي الله عنه - كە یەكەم پیاو دەستی بڕا لە موسڵمانان پیاوێک بوو لە ئەنصار هێنایان بۆ لای رسول الله ﷺ، وترا : دزی کردووە.

فەرمووی: (هاوەڵەکەتان ببەن دەستی ببڕن) .

وەک ئەوەی دەموچاوی رسول الله ﷺ بێتاقەتی پێوە دیار بێت، هەندێک لەوانەی مەجلیسەکە وتیان : ئەی پێغەمبەری الله وەک ئەوەی لەسەرت تووند بێت وات کرد ؟

فەرمووی : (رێگریم لێ ناکەن لەوەی ببنە یارمەتیدەری شەیطان یان ئیبلیس، درووست نیە بۆ وەلی ئەمر کە حەددێکی بچێتە لا ئیللا جێبەجێی بکات، الله لێبووردەیە و لێبووردنی خۆش ئەوێت) .

دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النور : ٢٢) .

١٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا محمد بن بكر بن خالد، حدثنا عبيد الله بن العباس بن الربيع الحارثي من أهل نجران اليمن بعرفات، حدثني محمد بن عبد الرحمن البيلماني، عن أبيه، عن ابن عمر قال : سمعت رسول الله ﷺ - وهو يوصي رجلاً - وهو يقول له : (أقل من الذنوب يهن عليك الموت، وأقل من الدين تعش حراً) .

١٨ - ابن عمر رضي الله عنه ئەفەرمووێ : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ ئامۆژگاری پیاوێکی ئەکرد و پێی فەرموو: (تاوانەکانت کەم بکەرەوە مردن لەسەرت ئاسان ئەبێت، وە قەرزەکانت کەم بکەرەوە بە ئازادی ئەژیت ) .

١٩ - **قال إبن أبي الدُّنيا : حدثنا إسحاق بن إبراهيم بن عبد الرحمن، حدثنا حسين بن محمد، حدثنا شيبان، عن نعيم بن أبي هند، عن إبراهيم، عن الأسود وعلقمة، عن عبد الله قال** : (إني لأعلم آيتين في كتاب الله لا يقرأهما عبد عند ذنب يصيبه، ثم يستغفر الله إلا غفر له .

قلنا : أي آيتين في كتاب الله ؟ فلم يخبرنا ففتحنا المصحف فقرأنا البقرة فلم نصب شيئاً، ثم قرأنا النساء فانتهينا إلى هذه الآية : ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ **(النساء : ١١٠)** .

قلت : أمسك هذه، ثم انتهينا في آل عمران إلى هذه التي يذكر فيها : ﴿ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ **(آل عمران : ١٣٥)** إلى آخرها ثم أطبقنا المصحف، وأخبرنا بهما عبد الله .

فقال : هما هاتان ) .

١٩ - الأسود و علقمة ئەڵێن : عبدالله - **ابن مسعود رضي الله عنه** - فەرمووی : (من شارەزام بە دوو ئایەت لە کیتابی الله بەندە نایخوێنێتەوە لەو کاتەی تووشی تاوان بووە دواتر داوای لێخۆش بوون بکات لە الله ئیللا لێی خۆش ئەبێت .

وتمان : کام دوو ئایەتەن لە کیتابی اللە؟ هەواڵی پێنەداین، موصحەفمان کردەوە، البقرة مان خوێند هیچمان نەدۆزیەوە، دواتر النساء مان خوێندەوە تا گەشتین بە ئەم ئایەتە : ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ **(النساء : ١١٠)** .

وتم ئەمە بگرە، دواتر لە آل عمران تا گەشتین بەم ئایەتە کە تیایا باس ئەکات : ﴿وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ **(آل عمران : ١٣٥)** تا کۆتاییەکەی، دواتر موصحەفمان داخست، هەواڵمان دا بە عبداللە .

فەرمووی : ئەو دووانەن) .

**٢٠ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني يعقوب بن عبيد، حدثنا يزيد بن هارون، أنبانا العوام ابن حوشب حدثني عبد الكريم المكتب، عن عبد الرحمن بن يزيد بن معاوية قال : (الكلمات التي تلقى آدم من ربه فتاب عليه : لا إله إلا أنت سبحانك اللهم وبحمدك، اللهم عملت سوءاً وظلمت نفسي فاغفر لي وأنت خير الغافرين، لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك عملت سوءاً وظلمت نفسي فارحمني وأنت خير الراحمين، لا إله إلا أنت سبحانك وبحمدك عملت سوءاً وظلمت نفسي فتب علي إنك أنت التواب الرحيم) .

**٢٠ -** عبدالرحمن بن يزيد بن معاوية ئەڵێ : ئەو وشانەی ئادەم وەریگرت لە پەروەردگاری و لێی خۆش بوو بەهۆیەوە : هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە تۆ، پاک و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆ یا اللە، یا اللە من کارێکی خراپم کرد و ستەمم لە نەفسی خۆم کرد لێم خۆش بە تۆ باشترینی لێخۆش بووانیت، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە تۆ پاک و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆ کارێکی خراپم کرد و ستەمم لە

نەفسی خۆم کرد ڕەحمم پێ بکە تۆ باشترین ڕەحم پێ کەرانیت ، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە تۆ پاک و بێگەردی بۆ تۆ کارێکی خراپم کرد و ستەمم لە نەفسی خۆم کرد تەوبەم لێ وەربگرە تۆ تەوبە وەرگر و بەڕەحمیت ) .

٢١ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني هارون بن عبد الله، حدثنا سعيد بن عامر، عن حزم قال : قال إبراهيم بن عيسى اليشكري - ونحن على باب المسجد - : (ما أفضل ما يدخل به اليوم الرجل ؟

قلت : لا أدري .

قال: توبة من ذنب أو نصيحة من قلب ) .

٢١ - حزم ئەڵێ : إبراهيم بن عيسى اليشكري وتی : (چ شتێک باشترینە کە پیاو پێی بچێتە ڕۆژەوە ؟

وتم : نازانم .

وتی: تەوبەکردن لە تاوان یان ئامۆژگاری لە دڵەوە ) .

٢٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا الحسن بن محبوب، حدثنا حجاج، قال ابن جريج أخبرني عبد الله بن كثير، أنه سمع مجاهداً يقول : (الران أيسر من الطبع، والطبع أيسر من الإقفال، والإقفال أشد ذلك).

**٢٣** - مجاهد ئەڵێ : (ڕەشبوونەوە باشترە لە مۆر، مۆر باشترە لە قوفڵ لێدان، قوفڵ لێدان توندترینە).

**: مەبەستی قۆناغەکانی مردنی دڵە، یەکەمجار ڕەش بوون، دواتر مۆرلێدان، پاشان قوفڵ لێدان، الله تعالی بمانپارێزێت بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی .**

**٢٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثنا بشار بن موسى وعبيد الله بن عمر قالا : حدثنا جعفر بن سليمان الضبعي، حدثنا الجعد أبو عثمان اليشكري، عن أبي رجاء العطاردي، عن ابن عباس قال : قال النبي ﷺ :** (من هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة، فإن عملها كتبت له عشراً إلى سبعمائة ضعف إلى أضعاف كثيرة، ومن هم بسيئة فلم يعملها كتبت له حسنة، فإن عملها كتبت عليه سيئة واحدة، أو يمحوها الله، ولا يهلك على الله إلا هالك).

**٢٥** - لە ابن عباس ـەوە ئەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (هەرکەس چاکەیەک بێت بە خەیاڵیا و نەیکات حەسەنەیەکی بۆ ئەنووسرێت، ئەگەر کردی دە تا حەوسەد تا زۆرترین هێندەی بۆی ئەنووسرێت، وە هەرکەس خراپەیەک بێت بە خەیاڵیا و نەیکات چاکەیەکی بۆ ئەنووسرێت، ئەگەر کردی ئەوا یەک خراپەی بۆ ئەنووسرێت، یان الله ئەیسڕێتەوە، کەس بە هیلاکەتدا ناڕوات لای الله ئیللا کەسێکی بەهیلاکچوودا نەبێت).

**: ئەو دێڕەی کۆتایی فەرموودەکە مەبەستی ئەوەیە دوای ئەو هەموو بەخشیشە لە حەسەنات و ئەو کەمی خراپانە ئەگەر بەوەشەوە تۆ هەر خراپەت زۆرتر بوو لە چاکە ئەوا شایەنی ئەوەی بە هیلاکدا بچیت، الله أعلم .**

٢٧ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا ابن إدريس، عن أبيه، عن وهب بن منبه قال : (قال رجل من العباد لابنه يا بني لا تكن ممن يرجو الآخرة بغير عمل، ويؤخر التوبة بطول الأمل) .

٢٧ - وهب بن منبه ئەڵێ : (پیاوێک لە عابدەکان بە کوڕەکەی فەرموو : ئەی کوڕی خۆم، لەوانە مەبە کە بەهیوای قیامەتن بەبێ کار و کردەوە، وە تەوبە دوائەخەن بەهۆی هیوادرێژیان) .

٢٨ - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا أبو سعيد الأشج الكندي، حدثنا إسحاق بن سليمان الرازي، عن عثمان بن زائدة قال : (قال لقمان لابنه يا بني، لا تؤخر التوبة؛ فإن الموت قد يأتي بغتة) .

٢٨ - عثمان بن زائدة ئەڵێ : (لقمان بە کوڕەکەی فەرموو : ئەی کوڕی خۆم، تەوبە دوامەخە، چونکە مردن لەناکاو دێت) .

٣٠ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا أبو معاوية، عن الأعمش عن وبرة، عن أبي الطفيل قال : قال ابن مسعود : (أكبر الكبائر الشرك بالله، والقنوط من رحمة الله، والأمن المكر الله، واليأس من روح الله) .

٣٠ - ابن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (گەورەترینی تاوانە گەورەکان شەریک بڕیاردانە بۆ الله، وە بێ ئومێد بوونە لە ڕەحمەتی الله، وە ئەمین بوونە لە مەکری الله، وە بێ هیوا بوونە لە ڕزگارکردنی الله) .

٣١ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني محمد بن هارون، حدثنا الحسن بن موسى، حدثنا مهدي بن ميمون، حدثنا واصل مولى أبي عيينة قال : دفع إلي يحيى بن عقيل صحيفة قال : أنبئت أن عبد الله بن مسعود كان يقول : (الذنوب أربعة : ذنبان مغفوران وذنبان لا يغفران، رجل عمل ذنباً خطأ فالله يمن ولا يعذبه عليها، وقد قال فيهما أنزل : ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ﴾ (**الأحزاب : ٥**) .

ورجل عمل ذنباً قد علم ما فيه فتاب إلى الله منه وندم على ما فعل، وقد جزى الله أهل هذا الذنب أفضل الجزاء، فقال في كتابه : ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ﴾ (**آل عمران : ١٣٥**) إلى آخر الآية .

وذنبان لا يغفرهما لأهلهما : رجل قد عمل ذنبا قد علم ما فيه فأصر عليه ولم يتب إلى الله منه، ولن يتوب الله على عبد حتى يتوب ولن يغفر الله المذنب حتى يستغفر، ورجل زين له سوء عمله فرآه حسنا، فإن هذه التي يهلك فيها عامة من يهلك من هذه الأمة) .

**٣١** - عبدالله بن مسعود رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (تاوانەکان چوارن : دووانیان لێبوردراون و دووانی تریان لێبوردراو نین، پیاوێک بە هەڵە تاوانێک ئەنجام ئەدات و الله منەت ئەکات بەسەریدا و سزای نادات لەسەری، وە دەربارەی ئەمە دابەزی : | وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ | **(الأحزاب : ٥)** .

وە پیاوێک تاوانێک ئەنجام ئەدات و ئەشزانێت تاوانە ئەگەڕێتەوە بۆ لای الله و پەشیمان ئەبێتەوە لەسەر ئەوەی کردوویەتی، الله پاداشتی ئەهلی ئەم تاوانە ئەداتەوە بە باشترین پاداشت، ئەفەرمووێ لە کیتابەکەی : | وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ | **(آل عمران : ١٣٥)** تا کۆتایی ئایەتەکە .

وە دوو تاوان هەن خاوەنەکانیان نابووردرێت : پیاوێک تاوانێک ئەنجام ئەدات و ئەشزانێت تاوانە بەردەوام ئەبێت لەسەری و ناگەڕێتەوە بۆ لای الله، وە الله بەندە نابورێت تا تەوبە نەکات، وە الله لە تاوانبار خۆش نابێت تا داوای لێخۆش بوون نەکات، وە پیاوێک کارە خراپەکەی بۆ ڕازێندراوەتەوە و بە باشی ئەبینێت، ئەمە ئەوەیە کە زۆربەی ئەم ئوممەتەی تیا بە هیلاکدا دەڕوات) .

---

**: یەکەم مەبەستی لە کەسێکی فاسقە کە تاوانێک بەردەوام ئەنجام ئەدات و ئەبێت بە خو لەلای، بۆ نمونە وەکو جگەرە کێشان، وە دووەم مەبەستی لە کەسێکی بیدعەچییە، کە بیدعەکەی بە باش و حەسەنە ئەزانێت و چاوەڕێی پاداشتە! بەڵام بە پێچەوانەوە ئەڕواتە ژێر تووڕەیی الله تعالی ـەوە، الله عز وجل پەنامان بدات .**

**٣٥ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثني محمد بن الحسين، حدثني الصلت بن حكيم، حدثني مسكين بن عبيد قال: سمعت مكرماً الأزدي - وكان من عباد أهل الجزيرة - يقول: كان** يقال: (من علم الإنابة خوف القلوب رعباً من سالف الذنوب).

٣٥ - مكرماً الأزدي ئەڵێ: (ئەوترا لە نیشانەی گەڕانەوە ترسانی دڵەکانە لە تاوانەکانی پێشوو).

**٣٦ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثني إسحاق بن حاتم المدائني، حدثنا سفيان بن عيينة، عن حميد، عن مجاهد، عن عبيد بن عمير قال:** (لا يأمن داود يوم القيامة يقول: ذنبي ذنبي، فيقال له: ادنه حتى يدنو إلى مكان كأنه يأمن به فذلك قوله: ﴿وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَئَابٍ﴾ (ص: ٢٥).

٣٦ - عبيد بن عمير ئەڵێ: (داود لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمین نیە و ئەڵێ: تاوانەکانم، تاوانەکانم، پێی ئەوترێت: نزیک بەرەوە تا نزیک ئەبێتەوە لە شوێنێک کە ئەمین بێت ئەمەش فەرمایشتی: ﴿وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَئَابٍ﴾ (ص: ٢٥).

**٣٨ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثني الحارث بن محمد التميمي، حدثنا سعيد بن عامر** حدثنا جسر أبو جعفر قال: (قلت ليونس: يا أبا عبد الله مررت بقوم يختصمون في القدر.

قال: لو كان أهمتهم ذنوبهم ما اختصموا في القدر).

**٣٨** - جسر أبو جعفر ئەڵێ : (بە یونس م وت: ئەی باوکی عبدالله تێپەڕیم بەلای کەسانێکدا کە دەمەدەمێیان ئەکرد لە قەدەردا .

وتی : ئەگەر خەمی تاوانەکانیان بووایە دەمەدەمیان نەئەکرد لە قەدەردا) .

**٣٩** - **قال إبن أبي الدُّنيا** : حدثنا الحسن بن يحيى العنبري، حدثنا الهيثم بن عبيد الصيد قال : لا أعلمه إلا سهيل أخو حزم حدثني قال : سمع ابن سيرين رجلاً يسب الحجاج .

فقال : مه أيها الرجل، إنك لو وافيت الآخرة كان أصغر ذنب عملته قط أعظم عليك من أعظم ذنب عمله الحجاج، واعلم أن الله حكم عدل إن أخذ من الحجاج لمن ظلم شيئاً فسيأخذ للحجاج ممن ظلمه، فلا تشغلن نفسك بسبه) .

**٣٩** - سهيل ئەڵێ : (گوێم لە ابن سيرين بوو پیاوێک جنێوی دا بە الحجاج، وتی: ئاگاداربە ئەی پیاو، ئەگەر بگەیتە قیامەت بچوکترین تاوان کە کردووتە گەورەتر ئەبێت لەسەرت لە گەورەترین تاوان کە الحجاج کردوویەتی، بزانە الله دادوەرێکی دادپەروەرە ئەگەر شتێک لە الحجاج وەربگرێتەوە کە بە زوڵم بردوویەتی ئەوا بۆ الحجاج یشی وەرئەگرێتەوە ئەوەی زووڵمی لێ کردبێت، نەفسی خۆت بە جنێودان پێی سەرقاڵ مەکە) .

---

: لەم وتەیەی ئیمام رحمه الله ئەوە تێئەگەین کە ئەگەر ئیمانداریش بین جنێو بدەین بە گەورەترین طاغوت و کافر لەشوێنی خۆیدا نەبێت و لەپێناوی الله نەبێت ئەوا الله حەقی ئەو کەسەمان لێ وەرئەگرێتەوە، الله أعلم .

٤٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني يعقوب بن عبيد، أنبأنا يزيد بن هارون، أنبأنا أبو يوسف الصيقل الحجاج بن أبي زينب قال : سمعت أبا عثمان النهدي يقول : (ما في القرآن آية أرجى عندي لهذه الآية من قوله : ﴿وَءَاخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَءَاخَرَ سَيْئًا عَسَى اللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (**التوبة : ١٠٢**) .

٤٣ - أبا عثمان النهدي ئەڵێ: هیچ ئایەتێک نیە لە قورئاندا هیوابەخشتر بێت لام لەم ئایەتە: ﴿وَءَاخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا وَءَاخَرَ سَيْئًا عَسَى اللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (**التوبة : ١٠٢**) .

٤٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن أبي رجاء القرشي قال : قال إبراهيم بن أدهم : (إنك إن أدمنت النظر في مرآة التوبة بان لك قبيح شر المعصية) .

٤٥ - إبراهيم بن أدهم ئەڵێ : (ئەگەر تۆ بەردەوام تەماشای ئاوێنەی تەوبە بکەیت ئەوا قێزەونی تاوانت بۆ دەرئەکەوێت) .

---

**: واتای ئەوەیە ئەگەر تۆبەت کرد ئەوەی قێزەونی تاوانت بۆ دەرئەکەوێت، بەڵام ئەگەر تۆبەت نەکرد ئەوە تاوانەکانت لەلا باش ئەبێت و قێزەونی تاوانت بۆ دەرناکەوێت .**

٤٨ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني محمد بن إدريس، أخبرني الحسن بن سعيد الباهلي قال : سمعت زهيراً البابي يقول لرجل : (كيف كنت بعدي ؟

قال : في عافية .

قال : إن كنت سلمت من المعاصي ، فإنك كنت في عافية ، وإلا فلا داء أدوى من الذنوب ) .

٤٨ - الحسن بن سعيد الباهلي ئەڵێ : (زهيرا البابي به پیاوێکی وت : چۆن بوويت دوای من ؟

وتی: له سەلامەتیدا بووم .

وتی: ئەگەر سەلامەت بووبیت له تاوان ئەوه له سەلامەتیدا بوويت، وه ئیللا هیچ نەخۆشیەک نیه پیستر بێت له تاوان ) .

٥١ - **قال إبن أبي الدّنيا** :حدثنا علي بن الجعد، أنبأنا شعبة، عن منصور، عن إبراهيم و مجاهد في قوله : | وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ | **(الرحمن : ٤٦)** .

قال: (هو الرجل يريد أن يذنب الذنب فيذكر مقام ربه فيدع الذنب ) .

٥١ - مجاهد دەربارەی فەرمایشتی : | وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ | **(الرحمن : ٤٦)** .

ئەڵێ : (ئەوه پیاوێکه ئەیەوێت تاوانێک ئەنجام بدات پێگه و مەقامی پەروەردگاری بیردێتەوه واز له تاوانەکه دێنێت ) .

٥٢ - **قال ابن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن إدريس، حدثني موسى بن أيوب، حدثنا مخلد ابن حسين عن خطاب العابد قال: (إن العبد ليذنب فيما بينه وبين الله، فيجيء إلى إخوانه فيعرفون ذلك في وجهه).

٥٢ - خطاب العابد ئەڵێ: (بەندە تاوانێک ئەنجام ئەدات لە نێوان خۆی و الله، ئەچێتە لای براکانی لە دەموچاویدا هەستی پێ ئەکەن).

٥٣ - **قال ابن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن إدريس، حدثنا عمران بن موسى بن يزيد الطرسوسي، حدثني أبو عبد الله الملطي قال: (كان عامة دعاء إبراهيم بن أدهم: اللهم انقلني من ذل معصيتك إلى عز طاعتك).

٥٣ - أبو عبدالله الملطي ئەڵێ: (زۆربەی دوعای إبراهيم بن أدهم ئەوە بوو: يا الله لە زەلیلی سەرپێچیت بمگوازەرەوە بۆ عیززەتی گوێڕایەڵیت).

٥٤ - **قال ابن أبي الدّنيا**: حدثني إسحاق بن إسماعيل، حدثنا جرير قال: حدثني أبو عبد الله قال: لما أراد موسى أن يفارق الخضر قال له موسى: أوصني.

قال: كن نفاعاً ولا تكن ضراراً، كن بشاشاً ولا تكن غضباناً، ارجع عن اللجاجة ولا تمش في غير حاجة، ولا تعير امرءاً بخطيئته، وابك على خطيئتك يا ابن عمران).

٥٤ - أبو عبدالله ئەڵێ: (کاتێک موسى ویستی لە الخضر جیابێتەوە پێی فەرموو: ئامۆژگاریم بکە.

فەرمووی : سوودبەخش بە زیانبەخش مەبە، دەم بە پێکەنین بە تورە مەبە، بگەڕێرەوە لە ئینکاری و مەگەڕێ لە شتی بێ پێویست، پیاو عەیبدار مەکە بە تاوانەکانی، لەسەر تاوانەکانت بگری ئەی کوڕی عمران ) .

٥٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن إدريس، حدثنا عبد العزيز بن الخطاب، حدثنا موسى بن أبي حبيب الطائفي، عن علي بن حسين سمع منه قال : (إنما التوبة بالعمل والرجوع من الأمر، وليست التوبة بالكلام ) .

٥٥ - علي بن حسين ئەڵێ : (تەوبە کردن بە کردەوە وە گەڕانەوە لە کارەکەیە، تەوبە کردن بە قسە نیە ) .

٥٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن عبد الله، حدثنا عمر بن أبي خليفة، حدثني أبو بدر، عن ثابت عن أنس قال : قال رجل : يا رسول الله، إني أذنب .

قال : (استغفر ) .

قال : فأستغفر وأعود .

قال : (فإذا عدت فاستغفر ) .

قال: وأستغفر ثم أعود .

قال : (فإذا عدت فعد في الثالثة والرابعة حتى يكون الشيطان هو المحسور ) .

٥٧ - أنس ئەفەرمووێ : پیاوێک وتی : ئەی رسول الله من تاوان ئەکەم .

فەرمووی : (داوای لێخۆش بوون بکە) .

وتی: داوای لێخۆش ئەکەم و ئەگەڕێمەوە سەری .

فەرمووی : (ئەگەر گەڕایتەوە سەری داوای لێخۆش بوون بکە) .

وتی : داوای لێخۆش ئەکەم و پاشان ئەگەڕێمەوە سەری .

فەرمووی: (ئەگەر گەڕایتەوە سەری بگەڕێرەوە لە سێیەم و چوارەم جارا تا شەیطان وای لێ دێت بێ تاقەت بێت) .

٥٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن داود القنطري، حدثنا أبو عبد الرحمن المقرئ حدثنا الربيع بن صبيح، عن قيس بن سعد قال : قال ابن عباس : (كل ذنب أصر عليه العبد كبير، وليس بكبير ما تاب منه العبد) .

٥٨ - ابن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (هەموو تاوانێک لەسەری بەردەوام بیت گەورەیە، وە گەورە نیە ئەگەر بەندە تەوبەی لێ بکات) .

٥٩ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن داود حدثني ابن أخي حفص بن ميسرة قال : قدم بشر بن روح المهلبي أميراً على عسقلان فقال: من ها هنا ؟

قيل : أبو عمر الصنعاني - يعني حفص بن ميسرة - فأتاه فخرج إليه .

فقال: عظني.

فقال : أصلح ما بقي من عمرك يغفر لك ما قد مضى منه، ولا تفسد فيما بقي فتؤخذ فيها قد مضى ) .

**٥٩** - برازای حفص بن ميسرة ئەڵێ : بشر بن روح المهلبي ئەمير گەشتە عەسقلان وتی : کێ لێرەیە ؟

وترا : أبو عمر الصنعاني واته حفص بن ميسرة، هاته دەرەوە بۆ لای .

وتی : ئامۆژگاریم بکە .

وتی : ئەوەی ماوتە لە تەمەنت چاکی بکە لێت ئەبوردرێت لەوەی کە ڕۆیشتووە، وە ئەوەی ماوتە تێکی مەدە چونکە ئەوەی پێشووشت ئەبات ) .

**٦٠ - قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني يعقوب بن عبيد الله، أنبأنا يزيد بن هارون، أنبأنا مسعر، عن سعد بن إبراهيم، عن طلق بن حبيب** قال : (إن حق الله أثقل من أن يقوم به العباد، وإن نعم الله أكثر من أن يحصيها العباد، ولكن أصبحوا توابين وأمسوا توابين ) .

**٦٠** - طلق بن حبيب ئەڵێ : (حەقی الله لەوە قورسترە بەندەکان پێی هەڵبسن، وە نیعمەتەکانی الله لەوە زۆرترن بەندەکان بیژمێرن، بەڵکو بەیانی بکەرەوە و لە تەوبەکەران بە، وە ئێوارە بکەرەوە و لە تەوبەکاران بە ) .

٦١ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني علي بن أبي مريم، عن محمد بن سعيد، عن أشعث بن شعبة قال : قال ابن عون : (لا تثقن بكثرة العمل فإنك لا تدري يقبل منك أم لا، ولا تأمن ذنوبك فإنك لا تدري هل كفرت عنك أم لا ، إن عملك عنك مغيب كله ما تدري ما الله صانع فيه أيجعله في سجين أم يجعله في عليين) .

٦١ - ابن عون ئەڵێ : (سیقەت بە زۆری کردەوەکانت نەبێت چونکە تۆ نازانیت لێت قبوڵ ئەکرێت یان نا ، وە ئەمین مەبە لە تاوانەکانت چونکە تۆ نازانیت سڕاوەتەوە لەسەرت یان نا ، کردەوەکانت لێت شاراوەن هەمووی نازانیت الله چیان لێ ئەکات ، ئایا لە سجين دایئەنێت یان لە عليين ) .

---

: سجين دۆڵێکە لە چینی حەوتەمی زەوی ، عليين لە چینی حەوتەمی ئاسمانە و نزیکە لە عەرشی الرحمن .

٦٢ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن أبي القاسم مولى بني هاشم قال : قال فضيل ابن عياض : (بقدر ما يصغر الذنب عندك كذا يعظم عند الله ، وبقدر ما يعظم عندك كذا يصغر عند الله ) .

٦٢ - فضيل بن عياض ئەڵێ : (بە هێندەی ئەوەی تاوانت لا بچووک بێت لای الله گەورە ئەبێت ، وە بە هێندەی ئەوەی گەورە بێت لات لای الله بچوک ئەبێتەوە ) .

٦٣ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني الحسين بن عبد الرحمن، حدثني إبراهيم بن رجاء قال : سمعت ابن السماك قال : (أصبحت الخليقة على ثلاثة أصناف : صنف من الذنب تائب موطن نفسه على هجران ذنبه لا يريد أن يرجع إلى شيء من سيئه هذا المبرز، وصنف يذنب ثم يندم ويذنب ويحزن يذنب ويذنب ويبكي هذا يرجى له ويخاف عليه، وصنف يذنب ولا يندم، ويذنب ولا يحزن، ويذنب ولا يبكي فهذا الخائن الحائد عن طريق الجنة إلى النار) .

٦٣ - ابن السماك ئەڵێ : (درووستكراوەكان ڕۆژ ئەكەنەوە لەسەر سێ پۆل : پۆلێكیان تەوبە ئەكات لە تاوان و نەفسی ڕادەهێنێت لەسەر وازهێنان لە تاوانەكە و نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ هیچ شتێكی ئەو تاوانە ئەمە بەرزە و دیارە، وە پۆلێكیان تاوان ئەنجام ئەدات و دواتر پەشیمان ئەبێتەوە و تاوان ئەنجام ئەدات و بێتاقەت ئەبێت و تاوان ئەنجام ئەدات و ئەگری ئەمە ئومێدی پێ ئەكرێت و ترسیش هەیە لەسەری، وە پۆلێكی تریان تاوان ئەنجام ئەدات و پەشیمان نابێتەوە تاوان ئەنجام ئەدات و بێتاقەت نابێت تاوان ئەنجام ئەدات و ناگری ئەمە خیانەتكارە و لایداوە لە ڕێگای بەهەشت بۆ دۆزەخ) .

٦٥ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني سويد بن سعيد، حدثنا الحكم بن سنان قال : كان مالك بن دينار يقول : (اللهم أنت أصلحت الصالحين فأصلحنا حتى نكون صالحين).

٦٥ - مالك بن دينار ئەیوت: (یا الله تۆ پیاوچاكانت چاك كردووە ئێمەش چاك بكە تا ببین بە پیاوچاك) .

٦٦ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني عون بن إبراهيم، حدثنا أحمد بن أبي الحواري قال: (سمعت أبا سليمان الداراني قال: إذا ذكرت الخطيئة لم أشته الموت، أقول أبقى لعلي أتوب).

٦٦ - أحمد بن أبي الحواري ئەڵێ: گوێم لێبوو أبا سليمان الداراني ئەیوت: (کاتێک تاوانێکم بیردێتەوە حەز بە مردن ناکەم، ئەڵێم بمێنم بەڵکو تەوبەی لێ بکەم).

٦٨ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن إدريس، أنه حدث عن حكام الرازي، عن أبي حاتم، عن الحسن بن عميرة قال: قيل للحسن: إن الناس يقولون: إن الحاج مغفور له.

قال: (آية ذلك أن يدع سيئ ما كان عليه).

٦٨ - الحسن بن عميرة ئەڵێ: بە الحسن یان وت: خەڵکانێک هەن ئەڵێن حاجی لە - تاوانەکانی - بووردراوە.

وتی: (نیشانەکەی ئەوەیە وازی لەو خراپە هێنابێت کە لەسەری بووە).

---

: واتە ئەو کەسەی حەجی کردووە کاتێک ئومێد ئەکرێت الله لێی خۆش بووبێت کە وازی هێنابێت لەو تاوانانەی پێشووی و حەجەکە بووبێتە مایەی گۆڕانی، الله أعلم.

٦٩ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن إدريس، حدثني عمران بن موسى قال: قال علي بن فضيل: (ويحي من يوم ليس كالأيام، أوه كم من قبيحة تكشفها القيامة غداً!).

٦٩ - علي بن فضيل ئەڵێ: (تیاچوون بۆم لە ڕۆژێک کە وەک ئەم ڕۆژانە نیە، ئەبێت چەند قێزەونی هەبێت کە سبەی لە قیامەت دەری بخات!).

٧٠ - **قال إبن أبي الدّنيا**: قال محمد بن علي بن شقيق: حدثني حامد، أنبأنا عبد الله - يعني ابن المبارك -، عن الأوزاعي قال: كان يقال: (من الكبائر أن يعمل الرجل الذنب فيحتقره).

٧٠ - الأوزاعي ئەڵێ: (ئەوترا لە تاوانە گەورەکان ئەوەیە پیاو تاوانێک ئەنجام بدات و بە کەم سەیری بکات).

٧٤ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن إدريس، حدثنا عبد الصمد بن محمد قال: كتب محمد بن يوسف الأصبهاني إلى بعض إخوانه: (أما بعد، فإن الدنيا دار عصمة الله أو الهلكة، والآخرة دار عفو الله أو النار).

٧٤ - عبدالصمد بن محمد ئەڵێ: محمد بن يوسف الأصبهاني بۆ هەنێک لە براکانی نووسی: (أما بعد، دونیا شوێنی پارێزبەندی الله یان بەهیلاکچوونە، وە ئاخیرەت شوێنی لێخۆشبوونی الله یان ئاگرە).

٧٥ - قال إبن أبي الدّنيا: حدثنا محمد بن أبي بكر، حدثنا سعيد بن أبي مريم، عن نافع بن يزيد قال: حدثني خالد بن يزيد، أن أبا رافع حدثه أن رسول الله ﷺ سئل كم للمؤمن من ستر؟

قال: (هي أكثر من أن تحصى، ولكن المؤمن إذا عمل خطيئة هتك منها سترا، فإذا تاب رجع إليه ذلك الستر وتسعة معه، فإذا لم يتب هتك عنه منها سترا واحدا حتى إذا لم يبق عليه منها شيء قال الله لمن شاء من ملائكته: إن بني آدم يعيرون ولا يغيرون فحفوه بأجنحتكم فيفعلون به ذلك، فإن تاب رجعت إليه الأستار كلها، وإن لم يتب عجت منه الملائكة، فيقول الله لهم: أسلموه فيسلموه حتى لا تستر منه عورة).

٧٥ - أبا رافع ئەگێڕێتەوە کە پرسیار کراوە لە رسول الله ﷺ کە ئیماندار چەنێک داپۆشینی هەیە؟

فەرمووی: (لەوە زۆرترە کە بژمێردرێت، بەڵام ئیماندار کاتێک تاوانێک ئەنجام ئەدات داپۆشینێکی لەسەر لائەچێت، کاتێک تەوبەی کرد ئەو داپۆشینەی بۆ ئەگەڕێتەوە و نۆ دانەش لەگەڵیدا، کاتێک تەوبەی نەکرد داپۆشێنێکی لەسەر لائەچێت تا ئەو کاتەی هیچ شتێکی لەسەر نامێنێتەوە الله بەهەر فریشتەیەک کە بیەوێت لە فریشتەکانی ئەفەرمووێ: بەنی ئادەم بێ عاری ئەکەن و ناگۆڕێن بە باڵەکانتان دەوری بدەن، ئەوانیش ئەوە ئەنجام ئەدەن، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا هەموو داپۆشینەکانی بۆ ئەگەڕێتەوە، ئەگەر تەوبەی نەکرد فریشتە ئەیشارنەوە، الله پێیان ئەفەرمووێ: بیپارێزن، ئەیپارێزن تا عەورەتی دەرنەکەوێت).

٧٦ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني الحسن بن قزعة، حدثنا سفيان بن حبيب عن ابن جريج، عن عبد الله بن عبد الرحمن المعمري، عن سعيد بن المسيب قال : (الناس يعملون أعمالهم من تحت كنف الله، فإذا أراد الله بعبد فضيحة أخرجه من تحت كنفه، فبدت منه عورته).

٧٦ - سعيد بن المسيب ئەڵێ : (خەڵكی كردەوەكانيان ئەنجام ئەدەن لەژێر پارێزبەندی الله، كاتێک الله بیەوێت بەندەیەک ئاشكرا بكات دەری ئەهێنێت لەژێر پارێزبەندی خۆی، عەورەتی دەرئەكەوێ).

---

: واتە حەیای ئەچێت و بۆ خەڵكیش دەرئەكەوێت كە كەسێكی خراپە، الله عز وجل بمانپارێزێت .

٧٧ - **قال إبن أبي الدّنيا** : حدثنا علي بن الجعد قال : أخبرني الربيع بن بدر، عن أيوب عن أبي قلابة، عن أبي إدريس الخولاني رفعه : (لا يهتك الله عبداً وفيه مثقال حبة من خيره).

٧٧ - أبي إدريس الخولاني به مرفوع ی ئەڵێ : (الله هیچ بەندەیەک ئاشكرا ناكات تا دەنكێک خێری تیا مابێت).

---

: به مرفوع ی واتە رفع ی ئەكات بۆ لای رسول الله ﷺ كە وای فەرمووبێت .

٧٨ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني محمد بن عمر المقدمي، حدثنا كثير بن هشام، حدثنا فرات بن سلمان عن ميمون بن مهران قال : (لا خير في الدنيا إلا لرجلين: التائب، أو رجل يعمل في الدرجات) .

٧٨ - ميمون بن مهران ئەڵێ : (خێر نیه لە دونیادا ئیللا بۆ دوو پیاو نەبێت : بۆ تەوبەکار، یان بۆ پیاوێک کە کردەوە ئەنجام ئەدات بۆ بەرزکردنەوەی پلەی) .

٨٠ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني محمد بن عمر بن علي، حدثني شيخ من عبد القيس قال : (طهر القلب من المعاصي لم يشبع من ذكر الله) .

٨٠ - محمد بن عمر بن علي ئەڵێ : شێخێک لە عبدالقیس وتی : (دڵی خاڵی و پاک لە تاوان تێرناخوات لە یادی الله) .

٨١ - **قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني الزبير بن أبي بكر، حدثني سعد بن سعيد بن أبي سعيد، عن أخيه، عن جده، عن علي بن أبي طالب رضى الله عنه أنه قال : ما حدثني أحد حديثا عن رسول الله ﷺ إلا سألته أن يقسم لي بالله لهو سمعه من رسول الله ﷺ إلا أبو بكر فإنه كان لا يكذب، قال : فحدثني أبو بكر أن رسول الله ﷺ قال: (ما من عبد يذنب ذنبا، ثم يقوم عند ذكره ذنبه ذلك فيتوضأ ثم يصلي ركعتين ويستغفر الله من ذنبه ذلك إلا غفره الله له) .

٨١ - علي بن أبي طالب رضي الله عنه ئەفەرمووێ: هيچ كەسێک فەرموودەی بۆ نەگێڕاومەتەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ ئيللا سوێندم داوە بە الله كە بيستوويەتی لە رسول الله بووە ﷺ جگە أبوبكر چونكە ئەو درۆ ناكات، أبو بكر رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە كە رسول الله ﷺ فەرموويەتی : (هيچ بەندەيەک نيە كە تاوانێک ئەنجام بدات دواتر هەڵسێت كاتێک تاوانەكەی بيردێتەوە دەستنوێژ بگرێت دواتر دوو ڕكات نوێژ بكات و داوای لێخۆش بوون بكات بۆ ئەو تاوانەی ئيللا الله لێی خۆش ئەبێت) .

٨٢ - قال إبن أبي الدُّنيا : حدثني بشر بن معاذ، حدثنا حماد بن واقد، عن ثابت قال : كنا مع ابن الزبير بسواد الكوفة فدخلت حائطاً أصلي ركعتين فافتتحت ﴿حمٓ * تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ * غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ﴾ (**غافر** : ١ - ٣) فإذا رجل من خلفي على بغلة شهباء عليه مقطعات يمنية، فقال لي : إذا قلت : ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ﴾، فقل : يا غافر الذنب اغفر لي ذنبي .

وإذا قلت : ﴿وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ﴾، فقل : يا قابل التوب تقبل توبت .

وإذا قلت : ﴿شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ﴾، فقل : يا شديد العقاب لا تعاقبني .

وإذا قلت : ﴿ذِي ٱلطَّوۡلِۖ﴾، فقل : يا ذا الطول طل علي منك برحمة .

فالتفت فإذا لا أحد فخرجت فسألت مر بكم رجل عليه مقطعات يمنية ؟

فقالوا : ما مر بنا أحد، فكانوا لا يرون إلا أنه إلياس .

٨٢ - ثابت ئەڵێ : لەگەڵ ابن الزبير بووين لە قەڕەباڵغی كوفە چووينە شوێنێكەوە دوو ڕكات نوێژ بكەين، كرديەوە بە : ﴿حمٓ * تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ

ٱلۡعَلِيمِ * غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ | (**غافر : ١ - ٣**)، پیاوێک لە پشتمەوە لەسەر سوارێک بوو کە جلی یەمەنی لەبەردابوو پێمی وت : کاتێک وتت | غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ | بڵێ ئەی لێخۆش بووی تاوان لە تاوانەکەم خۆش ببە .

وە کاتێک وتت | وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ | بڵێ ئەی قبوڵکەری تەوبە تەوبەکەم لێ قبوڵ بکە .

وە کاتێک وتت | شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ |، بڵێ ئەی ئەوەی سزات توندە سزام مەدە .

وە کاتێک وتت | ذِي ٱلطَّوۡلِۖ |، بڵێ ئەی خاوەنی بەخشندەیی ڕەحمەتی خۆتم پێ ببەخشە .

کاتێک لام کردەوە کەس نەبوو، چوومە دەرەوە و پرسیم : ئایا پیاوێک دای بەلاتاندا کە جلی یەمەنی لەبەردابێت ؟

وتیان : کەس بەلاماندا تێنەپەڕیوە، ئەوان نەیانبینیوە ئیللا ئەوە إلياس ـه.

**٨٣ - قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثنا أحمد بن بديل اليامي، حدثنا سلم بن سالم، حدثنا سعيد الحمصي، عن عاصم الحذامي، عن عطاء، عن ابن عباس قال** : قال رسول الله ﷺ : (التائب من الذنب كمن لا ذنب له، والمستغفر من الذنب وهو مقيم كالمستهزئ بربه، ومن آذى مسلماً كان عليه من الإثم مثل كذا وكذا ذكر شيئاً) .

**٨٣** - ابن عباس رضي الله عنه ئەفەرمووێ: رسول الله ﷺ فەرمووی : (تەوبەکەر لە تاوان وەک ئەوە وایە تاوانی نەکردبێت، وە ئەوەی داوای لێخۆش بوون ئەکات و

بەردەوامە لەسەر تاوانەکەی وەک ئەوە وایە گاڵتە بکات بە پەروەردگاری، وە هەرکەس ئازاری موسڵمانێک بدات ئەوە ئەوەندە و ئەوەندە تاوانی لەسەرە).

٨٨ - قال ابن أبي الدنيا : حدثني الحسين بن عبد الرحمن، حدثني محمد بن القاسم خراط العنبر، عن سفيان بن عيينة قال : (بينما أنا أطوف بالبيت وإلى جانبي أعرابي وهو ساكت، فلما أتم طوافه جاء إلى المقام فصلى ركعتين، ثم جاء فقام بحذاء البيت فقال : إلهي من أولى بالزلل والتقصير مني وقد خلقتني ضعيفا، ومن أولى بالعفو عني منك وعلمك في سابق، وقضاؤك بي محيط، أطعتك بإذنك والمنة لك، وعصيتك بعلمك والحجة لك، فأسألك بوجوب حجتك علي وانقطاع حجتي وفقري إليك وغناك عني إلا ما غفرت لي .

قال سفيان : ففرحت فرحا ما أعلم متى فرحت مثله حين سمعته يتكلم بهؤلاء الكلمات) .

٨٨ - سفيان بن عيينة ئەڵێ : (لەوکاتەی من طەوافم ئەکرد بە دەوری کەعبەدا لەلامەوە دەشتەکیەکی لێبوو بێدەنگ بوو، کاتێک طەوافەکەی تەواوکرد هات بۆ لای مەقام دوو ڕکات نوێژ بکات، دواتر هات بۆ لای بەرگی کەعبە، وتی: پەروەردگارم کێ ئەولاترە بە پێخلیسکان و کەموکوڕی لە من کە تۆ بە لاوازی درووستت کردووم، وە کێ ئەولاترە بە تۆ کە لێم خۆش بیت لەکاتێکدا زانیاری پێشینت هەیە دەربارەی من، وە بڕیاردانت دەوری گرتووم، گوێڕایەڵیم کردیت بە ویستی تۆ و منەتی تۆ، وە سەرپێچیم کردیت بە ئاگایی تۆ و بەڵگەش بۆ تۆیە تۆیە، داوات لێ ئەکەم بەوەی بەڵگەت هەیە بەسەرمەوە و بەڵگەم بڕاوە، وە فەقیریم بۆ لات و دەوڵەمەندیت لە من ئیللا لێم خۆش بیت .

سفیان ئەڵێ : ئاسوودە بووم بە ئاسوودە بوونێک کە نازانم کەی ئاسوودە بووم بەو شێوەیە کاتێک گوێم لەو وشانە بوو کە ئەیوت ) .

**٨٩ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثنا أبو حاتم، حدثني هدبة بن خالد، حدثنا سلام بن مسكين قال : سمعت قتادة يقول : (إن القرآن يدلكم على دائكم ودوائكم، أما داؤكم فذنوبكم، وأما دواؤكم فالاستغفار ) .

**٨٩ -** قتادة ئەڵێ : (قورئان ڕێنمونیتان ئەکات بۆ نەخۆشی و چارەسەرەکانتان، نەخۆشیەکانتان تاوانەکانتانە، وە چارەسەرەکانتان داوای لێخۆش بوونە ) .

**٩٠ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني الحسين بن أبي الأسد، حدثنا المعلى بن أسد، حدثنا عدي بن أبي عمارة، حدثنا زياد النميري، عن أنس بن مالك، عن رسول الله ﷺ قال : (إن الشيطان واضع خطمه في قلب ابن آدم، فإن ذكر الله خنس، وإن نسي الله التقم قلبه ) .

**٩٠ -** رسول الله ﷺ ئەفەرمووێ : (شەیطان لوتی ئەکاتە دڵی بەنی ئادەمەوە، کاتێک یادی الله ی کرد نامێنێت، وە ئەگەر الله ی لەیاد کرد دڵی هەڵئەکۆڵێت ) .

**٩٤** - قيل لبعض الحكماء : ما أنفع الحياء ؟

قال : (أن تستحي أن تسأله ما تحب وتأتي ما يكره) .

**٩٤** - به یەکێک لە داناکان وترا : بەسوودترین شەرم کامەیە ؟

وتی : (شەرم بکەیت لەوەی داوای ئەوەی لێ بکەیت کە حەزت لێیەتی، وە ئەوە ئەنجام بدەیت کە پێی خۆش نییە) .

**٩٧ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن إدريس قال : حدثنا محمد بن علي قال :** قال ابن السماك : (والله لقد أمهلكم حتى كأنه أهملكم) .

**٩٧** - ابن السماك ئەڵێ : (والله هێندە مۆڵەتی پێ داون و دوایخستوون وەکو بڵێیت فەرامۆشی کردبن) .

---

**: واتە ئێوە هەر تاوان ئەنجام ئەدەن و ئەویش سزاتان نادات وەک ئەوەی فەرامۆشی کردبن، مەبەستی حیلمی الله یە جل جلالە، والله أعلم .**

**٩٨ - قال إبن أبي الدّنيا : حدثني محمد بن إدريس، حدثنا محمد بن علي، حدثنا محمد** بن القاسم قال : كان جعفر بن محمد يقول: (كيف أعتذر وقد احتججت، وكيف أحتج وقد علمت ما صنعت) .

**٩٨** - جعفر بن محمد ئەڵێ : (چۆن عوزر بێنمەوە کە بەڵگە هەیە بەسەرمەوە، وە چۆن بەڵگە بێنمەوە کە تۆ ئەزانیت چیم کردووە) .

**٩٩ - قال إبن أبي الدّنيا** : حدثني محمد بن إدريس، حدثنا سويد بن سعيد، عن موسى ابن عمير، عن جعفر بن محمد، عن أبيه، أنه كان يقول في جوف الليل : (أمرتني فلم أنتمر، وزجرتني فلم أزدجر ، هذا عبدك بين يديك ولا أعتذر) .

**٩٩** - جعفر بن محمد لە باوکیەوە کە لە تاریکایی شەودا ئەیوت : (فەرمانت پێکردم و جێبەجێم نەکرد، ترساندتم و نەترسام، ئەمە بەندەکەتە لەبەردەمتدایە و بیانوو ناهێنمەوە) .

**١٠٠ - قال إبن أبي الدّنيا** : **حدثني محمد بن إدريس، حدثنا هريم بن عثمان، عن** سلام ابن مسكين قال : سألت نصرانياً ما أول الزبور ؟

قال : (طوبي لعبد لم يسلك سبيل الأئمة، ولم يجالس المستهزئين والخاطئين).

قال سلام فذكرت لمالك بن دينار فقال : صدق.

**١٠٠** - سلام بن مسكين ئەڵێ: پرسیارم کرد لە نەصرانیەک دەربارەی سەرەتای زەبور ؟

وتی: طوبی بۆ بەندەیەک کە ڕێگای تاوانبارانی نەگرتۆتە بەر، وە لەگەڵ گاڵتەچیان و هەڵەکاراندا دانانیشێت .

سلام وتى : ئەمەم باس كرد بۆ مالك بن دينار، وتى: ڕاسته .

**١٠١ - قال إبن أبي الدُّنيا** :حدثنا إسماعيل بن إبراهيم قال : حدثني صالح المري، عن مالك بن دينار قال : قرأت في الحكمة أن الله يقول: (أنا الله مالك الملوك، قلوب الملوك بيدي، فمن أطاعني جعلتهم عليه رحمة، ومن عصاني جعلتهم عليه نقمة فلا تشغلوا أنفسكم بسب الملوك، ولكن توبوا إلي أعطفهم عليكم) .

**١٠١ -** مالك بن دينار ئەڵێ : (له حيكمەتدا خوێندوومەتەوە كە الله ئەفەرمووێ: من الله ى خاوەن موڵكم، دڵى پاشاكان بەدەست منه، هەركەس گوێڕايەڵيم بكات ڕەحمەتى خۆم دائەنێم لەسەرى، وە هەركەس سەرپێچيم بكات تورەيى خۆم دائەنێم لەسەرى، نەفسى خۆتان سەرقاڵ مەكەن بە جنێودان بە پاشاكان، بەڵكو تەوبە بكەن بۆ لام نەرم و نيانى خۆم ئەبەخشم پێتان) .

**١٠٢ - قال إبن أبي الدُّنيا** :حدثنا أبو عقيل الأسدي، حدثنا أبو أسامة، حدثني داود بن يزيد حدثني . . . . . عن جارية الأنصاري : (أن رجلاً قرأ هذه الآية : ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ [**الجاثية** : ٢١]، يرددها ويبكي، ويركع ويسجد ليلته، حتى أصبح). ذكر أنه من الأنصار.

**١٠٢ -** له جارية الأنصارى كە : (پياوێک ئەم ئايەتەى خوێندەوە : ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ [**الجاثية** : ٢١]،

دووبارەی ئەکردەوە و ئەگریا، وە ڕکوع و سەجدەی ئەبرد شەوەکەی، تا بەیانی کردەوە).

١٠٣ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا أبو عقيل قال: سمعت حسين الجعفي قال: كنت أسمع محمد بن سوقة كثيراً يقول: (أستغفر الله الذي لا إله إلا هو الحي القيوم وأسأله توبة نصوحاً).

١٠٣ - حسين الجعفي ئەڵێ: گوێم لێبوو محمد بن سوقة زۆر ئەیوت: (داوای لێخۆش بوون ئەکەم لە الله کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لەو زیندوو و ڕاگرە، وە داوای تەوبەی نەصوحی لێ ئەکەم).

١٠٤ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثنا أبو عقيل قال: سمعت حسين الجعفي قال: كان محمد ابن سوقة يقول: (اللهم من ظن بنا خيراً أو ظنناه به فصدق قولنا وقوله).

١٠٤ - محمد بن سوقة ئەڵێ: (یا الله ئەوەی گومانی باشمان پێ ئەبات یان گومانی باشمان پێ بردووە ئەوە قسەی ئێمە و ئەویش بەڕاست بخەرەوە).

١٠٧ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني رجل من المتعبدين لا يتكلم في السنة إلا يوما واحدا يكلم فيه الناس، فأتاه رجل في ذلك اليوم الذي يتكلم فيه، فقال: أوصني.

فقال: هل أذنبت؟

قال: نعم .

قال: فعلمت أن الله كتبه عليك ؟

قال: نعم .

قال: فاعمل حتى تعلم أن الله قد محاه عنك .

١٠٧ – بۆ گێڕامەوە پیاوێک لە عابدەکان قسەی نەئەکرد لە ساڵەکەدا ئیللا ڕۆژێک نەبێت کە خەڵکی قسەیان تیا ئەکرد، پیاوێک هات بۆ لای لەو ڕۆژەی کە قسەی تیا ئەکرد، وتی : ئامۆژگاریم بکە .

وتی : تاوانت ئەنجام داوە ؟

وتی : بەڵێ .

وتی : زانیوتە کە الله لەسەری نووسیویت ؟

وتی : بەڵێ .

وتی : کردەوە بکە تا ئەو کاتەی ئەزانیت کە الله لەسەرتی سڕیوەتەوە .

١٠٩ - **قال إبن أبي الدّنيا** :**حدثنا محمد بن أبي سمينة، حدثنا بدل بن المحبر، حدثنا عباد ابن راشد عن داود بن أبي هند، عن أبي نضرة، عن أبي سعيد قال** : (إنكم لتعملون أعمالاً هي أدق في أعينكم من الشعر، كنا نعدها على عهد رسول الله ﷺ من الموبقات ) .

**١٠٩ -** أبي سعيد ئەفەرمووێ : (ئێوە کردەوە گەلێک ئەنجام ئەدەن کە لە چاوتاندا بچوکترە لە تاڵە موویەک، ئێمە لەسەردەمی رسول الله ﷺ لە لەناوبەرەکانمان هەژمارمان ئەکرد) .

**١١٢ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثني محمد بن حاتم حدثنا الحسن بن موسى الأشيب قال : سمعت زهير بن معاوية الجعفي، حدثنا عن أبي إسحاق الهمداني، عن أبي عبيدة، عن ابن مسعود قال : (إذا رأيتم الرجل منكم قارف ذنباً فلا تدعوا الله عليه ولا تسبوه، ولكن ادعوا الله أن يعافيه وأن يتوب عليه، فإنا كنا إذا رأينا الرجل ختم له بخير رجونا له، وإذا ختم له بشر خفنا عليه) .

**١١٢ -** ابن مسعود ئەفەرمووێ : (کاتێک پیاوێکتان بینی لەنێوتاندا کە تێکەڵی تاوان بووبوو دوعای لێمەکەن و جنێوی پێ مەدەن، بەڵکو داوا لە الله بکەن بیپارێزێ و تەوبەی لەسەر بکات، ئێمە کاتێک بمانبینیایە پیاوێک بە خێر کۆتایی پێئەهات - واتە لە سەرە مەرگدا - ئومێدمان پێی هەبوو، وە کاتێک بە شەڕ کۆتایی پێبهاتایە ترسمان هەبوو لەسەری) .

**١١٣ - قال إبن أبي الدّنيا :** حدثنا محمد بن حاتم، حدثنا الأشيب الحسن بن موسى حدثنا حماد بن سلمة، عن ثابت البناني : أن عبيد الله بن زياد قطع لصاً فجعل الناس يدعون عليه، فقال أبو برزة الأسلمي وعائذ بن عمرو : (يا أيها الناس لا تكونوا أعواناً للشيطان على أخيكم، واحمدوا الله الذي عافاكم) .

١١٣ - ثابت البناني ئەڵێ : (عبيدالله بن زياد دەستی دزێكی بڕی، خەڵكی دوعایان لێ ئەكرد، أبو برزة الأسلمي و عائد بن عمرو وتیان : ئەی خەڵكینە مەبن بە یارمەتیدەری شەیطان لەسەر براكەتان، سوپاسی الله بكەن كە ئێوەی پاراستووە) .

١١٥ - قال إبن أبي الدّنيا : **حدثني يعقوب بن عبيد، حدثنا معاذ بن فضالة، حدثنا عبد الله بن لهيعة، عن أبي قبيل، عن مالك بن أبي زيد الياسري، أنه سمع عبد الله بن عمرو** يقول : (من ذكر خطيئة عملها فوجل قلبه منها فاستغفر الله، لم يحسبها شيئاً حتى يمحاها) .

١١٥ - عبدالله بن عمرو ئەفەرمووێ : (هەركەس تاوانێكی بیربكەوێتەوە كە ئەنجامی داوە دڵی ڕابچڵەكێت لێی و داوای لێخۆش بوون بكات لە الله، هیچ شتێک حساب ناكات تا ئەیسڕێتەوە) .

١١٨ - قال إبن أبي الدّنيا : **حدثنا الحسين بن السكن البصري، حدثنا معلى بن أسد حدثنا ديلم بن غزوان قال : سمعت فرقد السبخي** يقول : (إذا عصم الرجل من ذنب سبع سنين لم يعد فيه أبدا) .

١١٨ - فرقد السبخي ئەڵێ : (ئەگەر پیاو حەوت ساڵ لە تاوانێک خۆی پاراست ئەوا هەرگیز بۆی ناگەڕێتەوە) .

١٢٣ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا سفيان، عن مسعر، عن قتادة، عن زرارة بن أوفي، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : (إن الله عفا لأمتي عما حدثت به أنفسها ما لم يعملوا أو يتكلموا ) .

١٢٣ - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله ئوممەتەکەمی عەفو کردووە لەوەی دێت بە نەفسیاندا مادام کردەوەی پێ نەکەن و قسەی پێ نەکەن ) .

١٢٥ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني الحسن بن عبد العزيز، حدثنا عمر بن أبي سلمة، عن سعيد بن عبد العزيز، أن بلال بن سعد قال : (الذكر ذكران : ذكر الله باللسان حسن جميل، وذكر العبد الله عند ما أحل وحرم أفضل ) .

١٢٥ - بلال بن سعد ئەڵێ : (یادکردنەوە دوو دانەیە : یادی الله بە زمان کە باش و جوانە، وە بەندە کاتێک یادی الله ئەکات لەوەی کە حەڵاڵ و حەرامی کردووە، ئەوەیان باشترە ) .

١٢٨ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني محمد بن الحسين، حدثنا إسماعيل بن عمر، حدثنا معروف بن واصل قال : سمعت محارب بن دثار يقول : (إن الرجل ليذنب فيجد له في قلبه وهنا ) .

١٢٨ - محارب بن دثار ئەڵێ : (پیاو تاوانێک ئەنجام ئەدات و بەهۆیەوە وەهنێک ئەکەوێتە دڵیەوە ) .

: وەهن واتە خۆشویستنی دونیا و ڕق لێبوونەوە لە مردن، الله أعلم .

١٢٩ - قال إبن أبي الدنيا :حدثنا يعقوب بن عبيد، حدثنا أبو مسهر الدمشقي، حدثنا صدقة بن خالد، حدثني محمد بن عبد الله الشعيثي، عن مسلمة بن عبد الله الجهني عن خالد بن اللجلاج، عن أبيه قال : كنا غلمانا نعمل في السوق فأمر رسول الله ﷺ برجل فرجم فجاء رجل يسألنا أن ندله على مكان الرجل الذي رجم فتعلقنا به فأتينا به رسول الله ﷺ، فقلنا : يا رسول الله، إن هذا جاء يسألنا عن ذلك الخبيث الذي رجم اليوم .

فقال رسول الله ﷺ : (لا تقولوا خبيث، فوالله لهو أطيب عند الله من المسك).

١٢٩ - خالد بن اللجلاج لە باوکیەوە ئەفەرمووێ : ئێمە گەنج بووین لە بازاڕ ئیشمان ئەکرد رسول الله ﷺ فەرمانی کرد بە پیاوێک ڕەجم بکرێت، پیاوێک هات پرسیاری لێکردین کە شوێنی ئەو پیاوەی پیشان بدەین کە ڕەجم کرا، هێنامان بۆ لای رسول الله ﷺ، وتمان : ئەی رسول الله ئەم پیاوە هاتووە پرسیارمان لێ ئەکات دەربارەی ئەو پیسەی کە ئەمڕۆ ڕەجم کرا .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (پێی مەڵێن پیس، والله ئەو لای الله بۆنخۆشترە لە میسك ) .

١٣٢ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني إسحاق بن حاتم قال: سمعت عبد المجيد بن عبد العزيز قال : حدثني شيخ من أهل مكة، عن حميد الأعرج، عن رجل من فقهاء أهل الشام قال : مكتوب في التوراة : (يا ويح ابن آدم يعمل بالخطيئة، ثم يستغفرني فأغفر له، ثم يعود لها فيستغفرني فأغفر له، ثم يعود لها فيستغفرني فأغفر له، يا ويح ابن آدم لا يريد ترك عمل بالخطيئة، ولا ييأس من رحمتي فقد غفرت له، فقد غفرت له، فقد غفرت له).

١٣٢ - حميد الأعرج ئەڵێ : پیاوێک لە فەقیهەکانی شام وتی : نوسراوە لە تەوڕاتدا : (وەیح بۆ بەنی ئادەم تاوانێک ئەنجام ئەدات، دواتر داوای لێخۆش بوونم لێ ئەکات لێی خۆش ئەبم، دواتر ئەگەڕێتەوە بۆی داوای لێخۆش بوونم لێ ئەکات لێی خۆش ئەبم، دواتر ئەگەڕێتەوە بۆی داوای لێخۆش بوونم لێ ئەکات لێی خۆش ئەبم، وەیح بۆ بەنی ئادەم نایەوێت واز بهێنێت لە ئەنجامدانی تاوان، وە بێ ئومێدیش نابێت لە ڕەحمەتم، لێی خۆش بووم، لێی خۆش بووم، لێی خۆش بووم) .

١٣٣ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني أبو بكر، حدثنا أبو مسهر، حدثني شيخ من حكم قال: قال الجراح بن عبد الله الحكمي - وكان فارس أهل الشام - : (تركت الذنوب حياة أربعين سنة، ثم أدركني الورع) .

١٣٣ - الجراح بن عبدالله الحكمي ئەڵێ : (وازم لە تاوانەکان هێنا بۆ ماوەی چل ساڵ، ئەمجا گەشتم بە وەرع) .

١٣٨ - **قال إبن أبي الدنيا** :حدثني عبد الرحمن بن صالح، حدثني طلحة بن سنان اليامي، عن ليث، عن صاحب له، عن مجاهد قال : (الأواب الحفيظ الذي يذنب الذنب سرا، ثم يتوب منه سراً) .

١٣٨ - مجاهد ئەڵێ : (الأواب الحفيظ ئەو کەسەیە کە تاوان ئەنجام ئەدات بە نهێنی، دواتر تەوبەی لێ ئەکات بە نهێنی) .

١٣٩ - **قال إبن أبي الدنيا** :حدثني عبد الرحمن بن صالح، حدثنا محمد بن فضيل، عن محمد بن السائب، عن أبي صالح، عن ابن عباس قوله : ﴿ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ﴾، قال : عمله الذنب من جهالته .

﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾ (**النساء : ١٧**)، قال : (التوبة قبل الموت في صحته).

١٣٩ - ابن عباس رضي الله عنه دەربارەی فەرمایشتی : ﴿ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ﴾ ئەڵێ : ئەنجامدانی تاوانەکە لە نەزانیەوەیەتی .

﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾ (**النساء : ١٧**)، (تەوبەکردنێتی پێش مردنی لەکاتی لەشساغیدا) .

١٤٢ - **قال إبن أبي الدّنيا** :حدثنا عبد الرحمن بن صالح الأزدي، حدثنا يحيى بن آدم عن مسعر، عن عون بن عبد الله قال :قال عمر : (جالسوا التوابين؛ فإنهم أرق شيء أفئدة).

١٤٢ - عمر بن عبدالعزيز ئەڵێ : (لەگەڵ تەوبەكاران دابنيشن، چونكە ئەوان نەرمترين دڵيان هەيە) .

١٤٤ - **قال إبن أبي الدّنيا** :حدثنا إسحاق بن إسماعيل، حدثنا سفيان، عن أسلم بن عبدالملك، عن بعض العلماء : ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ (سبأ : ٥٤)، قال: التوبة.

١٤٤ - أسلم بن عبدالملك لە يەكێک لە زانايانەوە دەربارەی : ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ (سبأ : ٥٤) ئەڵێ : (تەوبە) .

١٤٧ - **قال إبن أبي الدّنيا** :حدثني إبراهيم بن سعيد، حدثنا موسى بن إسماعيل، حدثنا سالم أبو غياث العتكي قال : سمعت بكر بن عبد الله المزني قال : (إن أعمال بني آدم ترفع، فإذا رفعت صحيفة فيها استغفار رفعت بيضاء، وإذا رفعت صحيفة ليس فيها استغفار رفعت سوداء) .

١٤٧ - بكر بن عبدالله المزني ئەڵێ : (كردارەكانی بەنی ئادەم بەرزئەكرێنەوە، كاتێک نامەكەی بەرزكرایەوە ئەگەر داوای لێخۆشبوونی تێدا بێت ئەوە بە سپێتی بەرز ئەكرێتەوە، وە كاتێک نامەكەی بەرزكرایەوە ئەگەر داوای لێخۆشبوونی تێدا نەبێت ئەوە بە ڕەشێتی بەرز ئەكرێتەوە) .

**١٤٨ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني محمد بن العباس بن محمد، حدثنا محمد بن عبد الله بن راشد، حدثنا محمد بن مطرف عن زيد يعني بن أسلم، عن عبد الرحمن بن البيلماني** قال : (اجتمع أربعة من أصحاب رسول الله ﷺ، فقال أحدهم : سمعت رسول الله ﷺ يقول : (إن الله يقبل توبة العبد قبل أن يموت بيوم) .

فقال الثاني : أنت سمعت هذا من رسول الله ؟

قال: نعم .

قال : وأنا سمعت رسول الله ﷺ يقول : (إن الله ليقبل قبل أن يموت بنصف يوم) .

فقال الثالث : أنت سمعت هذا من رسول الله ﷺ ؟

قال : نعم .

قال : وأنا سمعت رسول الله ﷺ يقول: (إن الله يقبل توبة العبد قبل أن يموت بضحوة) .

قال الرابع : أنت سمعت هذا من رسول الله ﷺ ؟

قال: نعم .

قال : وأنا سمعت رسول الله ﷺ يقول : (إن الله يقبل توبة العبد ما لم يغرغر بنفسه) .

١٤٨ - عبدالرحمن بن البيلماني ئەڵێ : (چوار لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ کۆبوونەوە، دانەیەکیان وتی : گوێم لە رسول الله بوو ﷺ کە ئەیفەرموو : (الله تەوبەی بەندە قبوڵ ئەکات پێش ئەوەی بمرێت بە رۆژێک) .

دووەم وتی : تۆ گوێت لێبووە لە رسول الله ـەوە ﷺ ؟

وتی : بەڵێ .

وتی : وە من گوێم لە رسول الله بوو ﷺ کە ئەیفەرموو : (الله تەوبەی بەندە قبوڵ ئەکات پێش ئەوەی بمرێت بە نیو رۆژ) .

سێیەم وتی : تۆ گوێت لێبووە لە رسول الله ـەوە ﷺ ؟

وتی : بەڵێ .

وتی : وە من گوێم لە رسول الله بوو ﷺ کە ئەیفەرموو : (الله تەوبەی بەندە قبوڵ ئەکات پێش ئەوەی بمرێت بە هێندەی هەڵهاتنی رۆژ) .

چوارەم وتی : تۆ گوێت لێبووە لە رسول الله ـەوە ﷺ ؟

وتی : بەڵێ .

وتی : وە من گوێم لە رسول الله بوو ﷺ کە ئەیفەرموو : (الله تەوبەی بەندە قبوڵ ئەکات مادام نەگاتە غەرغەرە) .

**١٤٩ - قال إبن أبي الدنيا: حدثني محمود بن خداش بن محمد، حدثنا محمد بن صبيح بن السماك، حدثنا سعيد بن بشير الشامي، عن قتادة قال: قال سلمان:** (إذا أسأت سيئة في سريرة فأحسن حسنة في سريرة، وإذا أسأت سيئة في علانية فأحسن حسنة في علانية؛ لكي تكون هذه بهذه).

**١٤٩ -** سلمان رضي الله عنه ئەفەرمووێ: (کاتێک خراپەیەکت ئەنجامدا لە نهێنیدا ئەوا چاکەیەکیش ئەنجام بدە لە نهێنیدا، وە کاتێک خراپەیەکت ئەنجامدا لە ئاشکرادا ئەوا چاکەیەکیش ئەنجام بدە لە ئاشکرادا، بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە جێگرەوەی ئەوە).

**١٥٠ - قال إبن أبي الدنيا: حدثني محمد بن المقدام العجلي، حدثنا معتمر بن سليمان قال: سمعت أبي يذكر عن قتادة عن أنس عن النبي ﷺ قال:** (إني لأتوب في اليوم مائة مرة).

**١٥٠ -** لە أنس ـەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (من لە ڕۆژێکدا سەد جار تەوبە ئەکەم).

١٥٣ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني محمد بن وزير الواسطي، حدثنا صحار العبدي، عن أبي خليفة، أن الحسن كان مختفياً في داره، فانتبه أبو خليفة ذات ليلة والحسن يبكي فقال له : ما أبكاك ؟

قال : (ذنب لي ذكرته فبكيت ) .

١٥٣ - له أبي خليفة ەوە كە الحسن لە ماڵەکەیدا خۆی شاردبووەوە، أبو خليفة بە ئاگا بوو کە ئەو شەوە الحسن ئەگریا، پێی وت : چی گریاندیتی ؟

وتی : (تاوانێکی خۆمم بیرکەوتەوە جا گریام) .

---

: إنا لله وإنا إليه راجعون، تەنها بیربکەرەوە ئەبێت تاوانی ئەوان چی بوو بێت لە ئاست تاوانی ئێمە ؟ ئەمجا ئەو ئەڵێت یەک تاوان ئەی ئێمە بۆ ئەو هەموو تاوانە چی بکەین ؟

١٥٦ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني الحسن بن محبوب، حدثنا أبو توبة، حدثنا المعتمر، عن أبي سعيد قال : سمعت الحسن يقول : (أكثروا من الاستغفار في بيوتكم، وعلى موائدكم، وفي طرقكم، وفي أسواقكم، وفي مجالسكم أينما كنتم فإنكم ما تدرون متى تنزل المغفرة ) .

١٥٦ - الحسن البصري ئەڵێ : (زۆر داوای لێخۆشبوون بکەن لە ماڵەکانتان، وە لەسەر خوانەکانتان، وە لەسەر ڕێگاکانتان، وە لە بازاڕەکانتان، وە لە مەجلیسەکانتان، لە هەر شوێنێک هەن چونکە ئێوە نازانن کەی لێخۆشبوون دائەبەزێت ) .

**١٥٧ - قال إبن أبي الدُّنيا :حدثنا أبو عبد الله المديني، حدثنا المعتمر بن سليمان، عن أبيه قال :** قال لقمان لابنه : (أي بني عود لسانك اللهم اغفر لي؛ فإن لله ساعات لا يرد فيهن سائلاً) .

**١٥٧ -** المعتمر بن سليمان له باوكيەوە ئەڵێ: لقمان بە کوڕەکەی فەرمووە: ئەی کوڕی خۆم، زمانت ڕابهێنە لەسەر وتنی : (یا الله لێم خۆش بە، چونکە کات گەلێک هەن لای الله دوعای تیا ڕەتناکرێتەوە) .

**١٥٨ - قال إبن أبي الدُّنيا :حدثنا عمر بن يحيى بن نافع الثقفي، حدثنا معاوية بن عبد الكريم الثقفي قال :** سمعت بكر بن عبد الله المزني يحدث قال : (بلغنا أن داود عليه السلام كان يدعو على الخطائين قبل أن يصيب الذنب، فلما أصاب الذنب قال : يا رب اغفر للخطائين لعلك أن تغفر لي معهم) .

**١٥٨ -** بكر بن عبدالله المزني ئەڵێ: (پێمان گەشتووە کە داود علیه السلام کە دوعای بۆ هەڵەکاران ئەکرد پێش ئەوەی تووشی تاوان ببێت، کاتێک تووشی تاوان بهاتایە ئەیفەرموو : ئەی پەروەردگار لە هەڵەکاران خۆش بە بەو هیوایەی لەگەڵ ئەوان لە منیش خۆش بیت) .

**١٥٩ - قال إبن أبي الدُّنيا :حدثني محمد بن يحيى بن أبي حاتم، حدثني أبو داود الضرير قال :** قال أبو حازم : (نحن لا نريد أن نموت حتى نتوب، ولا نتوب حتى نموت، اعلم أنك إن مت لم ترفع الأسواق لموتك، إن شأنك صغير فاعرف نفسك) .

١٥٩ - أبو حازم ئەڵێ : (ئێمە نامانەوێت بمرین هەتا تەوبە نەکەین، وە تەوبە ناکەین هەتا نەمرین، بزانە ئەگەر تۆ بمریت بازاڕەکان لەبەر تۆ هەڵناگیرێن، بەڕاستی پلە و پێگەت کەمە، خۆت بناسە) .

١٦٠ - **قال إبن أبي الدّنيا :حدثني محمد بن يحيى بن أبي حاتم الأزدي، حدثنا داود بن المحبر، حدثنا سليمان بن الحكم بن عوانة، عن محمد بن واسع قال** : (الذنب على الذنب يميت القلب) .

١٦٠ - محمد بن واسع ئەڵێ : (تاوان لەسەر تاوان دڵ ئەمرێنێت) .

١٦١ - **قال إبن أبي الدّنيا :حدثني الحسن بن محبوب، حدثنا الفيض بن إسحاق أبو يزيد الرقي، قال حذيفة يعني المرعشي : أنبأنا عمار بن سيف عن الأعمش قال** : كنا عند مجاهد فقال : القلب هكذا - وبسط كفه - فإذا أذنب الرجل ذنباً هكذا، فعقد واحدا، ثم إذا أذنب عقد اثنين، ثم ثلاثاً، ثم أربعاً، ثم رد الإبهام على الأصابع في الذنب الخامس، فطبع على قلبه قال مجاهد : فأيكم يرى أنه لم يطبع على قلبه ؟!

١٦١ - الأعمش ئەڵێ : ئێمە لای مجاهد بووین وتی : (دڵ ئاوایە - دەستی کردەوە - کاتێک پیاو تاوانێکی ئەنجام دا ئاوای لێ دێ، دانەیەکی داخست - **واتە پەنجەیەک** -، دواتر تاوانێک ئەنجام ئەدات دووەمی داخست، دواتر سێیەم، دواتر چوارەم، دواتر پەنجە گەورەی دانا لەسەر پەنجەکانی تری لە تاوانی پێنجەمدا، مۆر ئەدرێت لەسەر دڵی، مجاهد وتی : کەستان وای ئەبینن کە مۆر نەدرابێت لەسەر دڵی ؟!) .

**١٦٧ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثنا مجاهد بن موسى، حدثنا إسماعيل بن علية، عن** ليث عن الحكم قال : (إذا كثرت ذنوب العبد ولم يكن له من العمل ما يكفرها عنه ابتلاه الله بالحزن ليكفرها عنه) .

**١٦٧ -** الحكم ئەڵێ : (کاتێک بەندە تاوانی زۆر بوو و کاری باشی نەبوو کە پێی بسڕێتەوە الله تووشی دڵتەنگی ئەکات بۆ ئەوەی لەسەری بسڕێتەوە) .

---

**: بۆیە داوا بکەین لە الله سبحانە وتعالی کە بچوکترین ئازار و دڵتەنگی هەروا بەسەرمان تێنەپەڕێت و تاوانێکمان لەسەر بسڕێتەوە بە فەزڵی خۆی.**

**١٦٨ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثنا أبو عبد الله التيمي، حدثنا سيار، عن جعفر، عن** مالك ابن دينار قال : (بلغني أن فتى أصاب ذنبا فيما مضى فأتى نهراً ليغتسل فذكر ذنبه فوقف واستحيا فرجع، فناداه النهر يا عاص لو دنوت مني لغرقتك) .

**١٦٨ -** مالك بن دينار ئەڵێ : (پێم گەشتووە کە گەنجێک تووشی تاوانێک بووە لە ڕابردوودا ئەچێتە لای ڕووبارێک بۆ ئەوەی خۆی بشوات، تاوانەکەی بیرئەکەوێتەوە، ئەوەستێت و شەرم ئەکات ئەگەڕێتەوە، ڕووبارەکە بانگی ئەکات : ئەی تاوانبار ئەگەر لێم نزیک ببوایتەوە ئەوا نوقمم ئەکردیت) .

١٦٩ - قال ابن أبي الدّنيا :حدثنا يحيى بن عبد الحميد الحماني، حدثنا أبي، حدثنا عثمان ابن واقد، عن أبي نصيرة قال : لقيت مولى أبي بكر فقلت : سمعت من أبي بكر شيئاً ؟

فقال : نعم، سمعت أبا بكر يقول : قال رسول الله ﷺ : (ما أصر من استغفر ولو عاد في اليوم سبعين مرة) .

١٦٩ - أبي نصيرة ئەڵێ : گەشتم بە مەولاكەی أبي بكر پێم وت : هیچ شتێكت لە أبي بكر بیستووە ؟

وتی : بەڵێ، گوێم لە أبا بكر بوو كە ئەیفەرموو: رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (موصیرٍ نیە ئەو كەسەی داوای لێخۆش بوون بكات ئەگەر چی لە ڕۆژێكدا ٧٠ جار بۆی بگەڕێتەوە) .

---

**: موصیرٍ ئەو كەسەیە كە بەردەوامە لەسەر تاوان، جا مانای ئەم فەرموودە ئەوەیە مادام لە دوای هەموو تاوانێک داوای لێخۆش بوون ئەكات ئەوە بە كەسێكی بەردەوام بوو لەسەر تاوانەكە هەژمار ناكرێت، لەگەڵ ئەو هەموو فەزڵی تەوبە و داوای لێخۆش بوونە ئەبێت ئاگاداری مەترسی بەردەوام بوون لەسەر تاوان بین، سەیری ئەثەری ١٦١ بكە، الله أعلم .**

١٧٠ - قال ابن أبي الدّنيا :حدثنا سعيد بن سليمان، عن أبي شيبة الخراساني، حدثنا ابن أبي مليكة، عن ابن عباس قال : قال رسول الله ﷺ : (لا صغيرة مع إصرار، ولا كبيرة مع استغفار) .

**١٧٠** - له ابن عباس ـەوە ئەفەرمووێ: رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بچوک نیە لەگەڵ بەردەوامێتی، گەورە نیە لەگەڵ داوای لێخۆش بوون) .

**: واتە ئەگەر تۆ تاوانێکی بچووک بکەیت و بەردەوام بیت لەسەری و داوای لێخۆش بوونی لەسەر نەکەیت ئەوا زۆر گەورەیە لای الله جل جلالە، بەڵام ئەگەر تاوانێکی گەورە بکەیت بەڵام داوای لێخۆش بوونی لەسەر بکەیت ئەوا بچوکە لای الله جل جلالە، الله أعلم .**

**١٧٣ - قال إبن أبي الدّنيا** :حدثني أحمد بن إبراهيم الموصلي، حدثنا أبو الأحوص، عن أبي إسحاق، عن أبي المغيرة قال :قال حذيفة : شكوت إلى رسول الله ﷺ ذرب لساني، فقال : (أين أنت من الاستغفار ؟! إني لأستغفر الله كل يوم مائة مرة) .

**١٧٣** - حذيفة ئەفەرمووێ : شەکوای زمان خراپی خۆم بردە لای رسول الله ﷺ.

فەرمووی : (تۆ لەکوێی استغفار دایت ؟ من هەموو رۆژێک ١٠٠ جار داوای لێخۆش بوون لە الله ئەکەم) .

**١٧٤ - قال إبن أبي الدّنيا** :حدثني إبراهيم بن عبد الله الهروي، أنبأنا هشيم، أنبأنا العوام ابن حوشب عمن حدثه عن علي قال : خياركم كل مفتن تواب .

قيل : فإن عاد ؟

قال : يستغفر الله ويتوب.

قيل : فإن عاد ؟

قال : يستغفر الله ويتوب .

قيل : حتى متى ؟

قال : حتى يكون الشيطان هو المحسور .

١٧٤ - علي رضي الله عنه ئەفەرمووێ : (باشترینتان تووشبوویەکی تەوبەکارە .

وترا : ئەگەر گەڕایەوە ؟

فەرمووی : داوای لێخۆش بوون لە الله ئەکات و تەوبە ئەکات .

وترا : ئەگەر گەڕایەوە ؟

فەرمووی : داوای لێخۆش بوون لە الله ئەکات و تەوبە ئەکات .

وترا : هەتا کەی ؟

فەرمووی : تا شەیطان هیوا بڕاو ئەکات ) .

١٧٥ - **قال إبن أبي الدّنيا** :**حدثنا هارون بن عبد الله، حدثنا سيار، حدثنا موسى بن سعيد الراسبي، حدثنا عون العقيلي** قال : قرأت في التوراة : (ابن آدم خطاء، وأنا غفار، وخير الخطائين المستغفرون ) .

١٧٥ - عون العقيلي ئەڵێ : لە تەوراتدا خوێندوومەتەوە: (بەنی ئادەم هەڵەکارن، وە من لێخۆش بووم، وە باشترین هەڵەکاران ئەوانەن داوای لێخۆش بوون ئەکەن ) .

**١٧٦ - قال إبن أبي الدنيا :حدثنا هارون، حدثنا سيار، حدثنا محمد بن مروان العجلي حدثنا يونس بن عبيد قال:** سمعت بكر بن عبد الله المزني يقول : (إنكم تكثرون من الذنوب، فاستكثروا من الاستغفار، فإن العبد إذا وجد يوم القيامة بين كل سطرين من كتابه استغفاراً سره مكان ذلك) .

**١٧٦ -** بكر بن عبدالله المزني ئەڵێ : (ئێوە زۆر تاوان ئەنجام ئەدەن، بۆیە داوای لێخۆش بوون زۆر بکەن، بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێک بینی لەنێوان هەموو هێڵێک لە کیتابەکەی استغفار ی تیایە ئەو شوێنەی پێ خۆشە) .

**١٧٧ - قال إبن أبي الدنيا :**حدثني علي بن الحسن بن أبي مريم قال : (قال رياح القيسي: لي نيف وأربعون ذنباً، قد استغفرت لكل ذنب مائة مرة) .

**١٧٧ -** رياح القيسي ئەڵێ : (**٤٥** تاوانم هەیە بۆ هەر یەکێکیان سەد جار داوای لێخۆش بوونم کردووە).

**١٧٨ - قال إبن أبي الدنيا :حدثنا عبد الرحمن بن صالح الأزدي، حدثنا أسد بن عمرو البجلي، عن أشعث، عن ابن سيرين قال :** سئل عن هذه الآية : ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ﴾ **(آل عمران : ١٣٥)** .

قال ابن سيرين : (أعطانا الله هذه الآية مكان ما جعل لبني إسرائيل في كفارات ذنوبهم) .

**١٧٨** - له أشعث ـەوە له ابن سيرين ـەوە كه پرسيارى لێكراوە دەربارەى ئەم ئايەتە | وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ | **(آل عمران : ١٣٥)** .

ابن سيرين وتى : (الله ئەم ئايەتەى پێ بەخشيوين له شوێنى ئەوەى كه بەخشى به بەنى ئيسرائيل له كەفارەتى تاوانەكانيان) .

**١٧٩** - **قال إبن أبي الدّنيا** :**حدثني محمد بن الحسين، حدثني شهاب بن عباد، حدثنا سويد بن عمرو الكلبي، عن مسلمة بن جعفر قال : حدثني أبو الأسدي قال** : قال عون بن عبد الله : (جالسوا التوابين؛ فإن رحمة الله إلى النادم أقرب) .

**١٧٩** - عون بن عبدالله ئەڵێ : (لەگەڵ تەوبەكاران دابنيشن، چونكە ڕەحمەتى الله نزيكترە لە كەسى پەشيمان بووەوە لە تاوان) .

**١٨٠** - **قال إبن أبي الدّنيا** :**حدثنا علي بن الجعد، أنبأنا سفيان بن سعيد قال** : قال الشعبي : (التائب من الذنب كمن لا ذنب له، ثم تلا : | إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ | **(البقرة : ٢٢٢)** .

**١٨٠** - الشعبي ئەڵێ : ئەوەى تەوبە ئەكات له تاوان وەک ئەوە وايە تاوانى نەكردبێت، دواتر ئەمەى خوێندەوە : | إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ | **(البقرة : ٢٢٢)** .

١٨١ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثنا الحكم بن موسى، حدثنا غسان بن عبيد، عن أبي عاتكه، عن أنس بن مالك قال :قال رسول الله ﷺ : (إن الله يحب الشاب التائب) .

١٨١ - له أنس بن مالك ەوە كە ئەفەرمووێ : رسول الله ﷺ فەروویەتی : (الله گەنجی تەوبەكاری خۆش ئەوێت) .

١٨٢ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثني محمد بن الحسين، حدثنا بكر بن محمد البصري حدثنا سالم بن نوح العطار، عن عمر بن موسى القرشي، عن عون بن عبد الله قال : (التائب أسرع دمعة، وأرق قلباً) .

١٨٢ - عون بن عبدالله ئەڵێ : (كەسی تەوبەكار خاوەنی خێزاترین فرمێسک، وە نەرمترین دڵە) .

١٨٣ - قال إبن أبي الدّنيا :حدثنا محمد بن الحسين، حدثني عياش بن عصام الكلبي حدثنا مسلم الأعور، عن عون بن عبد الله بن عتبة قال : (اهتمام العبد بذنبه داع إلى تركه، وندمه عليه مفتاح لتوبته، ولا يزال العبد يهتم بالذنب يصيبه حتى يكون أنفع له من بعض حسناته) .

١٨٣ - عون بن عبدالله ئەڵێ : (بیركردنەوەی بەندە لە تاوانەكەی ڕای ئەكێشێت بۆ وازهێنان لێی، وە پەشیمان بوونەوەی لێی كلیلە بۆ تەوبەكەی، بەردەوام بەندە

خەیاڵی لای ئەو تاوانەیە کە تووشی بووە تا وای لێ دێت بەسوودتر ئەبێت بۆی لە هەندێک چاکەکانی ) .

---

**: واتە کەسێک تاوانێک ئەنجام ئەدات دواتر پەشیمان ئەبێتەوە لێی و بەردەوامیش خەیاڵی لای ئەو تاوانەیە و خۆی بە شەرمەزار ئەزانێت لای الله جل جلالە و وا دای ئەنێت هەرچی کردەوەی باش بکات جێگای ئەو تاوانە ناسڕێتەوە و زۆر بە گەورەی ئەزانێت ئەمەش وا ئەکات کە ئەو تاوانە ببێتە هۆی خێرێکی زۆر بۆی، بۆیە سەلەف ئەفەرموون: تاوانی وا هەیە خاوەنەکەی ئەباتە بەهەشت چونکە هەمیشە خەیاڵی لایەتی و کردەوەی باش ئەکات لە شوێنی، چاکەی واش هەیە خاوەنەکەی ئەباتە دۆزەخ چونکە بە بۆنەی ئەو چاکەوە پاڵ ئەداتەوە و تووشی عجب ئەبێت، سەیری ئەثەری ٢٠٥ بکە، الله أعلم.**

**١٨٤ - قال إبن أبي الدّنيا:** حدثني محمد بن علي بن الحسن بن شقيق ، حدثني أبي ، عن أبي عبد الرحيم ، عن مقاتل ، عن الحسن ﴿ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ (**محمد** : ٣٣) قال : (بالمعاصي ) .

**١٨٤** - الحسن البصري دەربارەی : ﴿ وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ (**محمد** : ٣٣) ئەڵێت : (بە تاوان ) .

١٨٧ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد بن الحسين، حدثنا عمرو بن جرير قال: سمعت أبا طالب القاص حدث عن عطية العوفي قال : (بلغني أنه من بكى على خطيئة محيت عنه ) .

١٨٧ - عطية العوفي ئەڵێ : (پێم گەشتووە کە هەرکەسێک بگریەت لەسەر تاوانەکەی ئەوا لەسەری ئەسڕدرێتەوە ) .

١٨٨ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني محمد قال : حدثنا خالد بن يزيد عن حازم بن حسين، عن مالك بن دينار قال : (البكاء على الخطيئة يحط الخطايا كما يحط الريح الورق اليابس ) .

١٨٨ - مالك بن دينار ئەڵێ : (گریان لەسەر تاوان تاوانەکان هەڵئەوەرێنێت وەک چۆن با گەڵای وشک هەڵئەوەرێنێت ) .

١٩٠ - **قال إبن أبي الدّنيا**: حدثني إبراهيم بن سعيد، حدثنا موسى بن أيوب، حدثنا مخلد، عن هشام أو غيره، عن الحسن قال : (العمل بالحسنة نور في القلب، وقوة في البدن، والعمل بالسيئة ظلمة في القلب، ووهن في البدن ) .

١٩٠ - الحسن البصري ئەڵێ : (ئەنجامدانی کردەوەی باش نورە لە دڵدا، وە هێزە لە لەشدا، وە ئەنجامدانی کردەوەی خراپ تاریکاییە لە دڵدا، وە تەمەڵیە لە لەشدا ) .

١٩٢ - **قال إبن أبي الدّنيا**: **حدثني أبي حدثنا الأصمعي عن المعتمر بن سليمان، عن** أبيه قال : (إن الرجل ليصيب الذنب في السر فيصبح وعليه مذلته) .

١٩٢ - المعتمر بن سليمان له باوكيەوە ئەڵێ : (پیاو تاوانێک ئەنجام ئەدات له نهێنیدا بەیانی ئەکاتەوە و زەلیلی تاوانەکەی پێوە دیارە) .

١٩٣ - **قال إبن أبي الدّنيا**: **حدثني سريج بن يونس، حدثنا عباد بن العوام، عن عاصم** قال : سمعت الحسن في قول الله تعالى : ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ **(المطففين: ١٤)** .

قال : (أتدرون ما الإرانة ؟ الذنب بعد الذنب، والذنب بعد الذنب حتى يموت القلب) .

١٩٣ - عاصم ئەڵێ : گوێم له الحسن بوو دەربارەی فەرمایشتی الله تعالى : ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ **(المطففين: ١٤)**

وتی : (ئەزانن ڕەشبوون چیه ؟ تاوان دوای تاوان، وە تاوان دوای تاوان تا دڵی ئەمرێت) .

١٩٥ - **قال إبن أبي الدّنيا**: **حدثني عبد الله بن أبي بدر، حدثنا الوليد بن مسلم، حدثنا محمد بن عجلان، حدثني القعقاع بن حكيم، عن أبي صالح، عن أبي هريرة، عن النبي ﷺ قال:**

(إن العبد إذا أذنب ذنباً كانت نكتة سوداء في قلبه، فإن تاب صقل قلبه، وإن زاد

زادت حتى يسود قلبه، فذلك قول الله تعالى : | كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ | (**المطففين** : ١٤) .

**١٩٥** - له أبي هريرة ـەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی : (بەندە كاتێک تاوانێک ئەنجام ئەدات خاڵێکی ڕەش ئەکەوێتەوە سەر دڵی، ئەگەر تەوبەی لێکرد دڵی پاڵفتە ئەبێتەوە، ئەگەر زیادی کرد ئەویش زیاد ئەکات تا دڵی ڕەش ئەبێت ئەمەش فەرمایشتی الله تعالی یە | كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ | (**المطففين** : ١٤).

**١٩٩** - **قال إبن أبي الدُّنيا** :حدثنا بندار، حدثنا يحيى بن سعيد عن شعبة، عن أبي بشر عن سعيد بن جبير : | فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا | (**الإسراء** : ٢٥) .

قال : الرجاعين إلى الخير .

**١٩٩** - له سعيد بن جبير ـەوە دەربارەی : | فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا | (**الإسراء** : ٢٥) .

ئەڵێ : (ئەوانەی ئەگەڕێنەوە بۆ خێر) .

**٢٠٠** - **قال إبن أبي الدُّنيا** :حدثنا داود بن رشيد حدثنا بقية عن مبشر بن عبيد عن زيد بن أسلم في قوله : | وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا | (**فصلت**: ٢١) .

قال: قالوا لفروجهم لم شهدتم علينا.

**٢٠٠** - زيد بن أسلم دەربارەی : | وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ | (**فصلت:** **٢١**) .

ئەڵێ : (بە داوێنیان وت بۆچی شاهیدیتان لەسەر داین) .

**٢٠٣** - **قال إبن أبي الدّنيا** :وحدثنا محمد بن علي، حدثنا إبراهيم قال : سمعت فضيل بن عياض يقول : (ما يؤمنك أن تكون بارزت الله بعمل مقتك عليه فأغلق دونك باب المغفرة، كيف ترى يكون حالك ؟!)

**٢٠٣** - فضيل بن عياض ئەڵێ : (چی ئەمینت ئەکات لەوەی دەرکەوتبێتیت لای الله بە کردەوەیەک الله بەهۆیەوە ڕقی لێت ببووبێتەوە جا دەرگای لێخۆش بوونی لێ داخستبێتیت، ئەوکات حاڵت چۆن ئەبێت ؟) .

**٢٠٤** - **قال إبن أبي الدّنيا** :حدثنا محمد، حدثنا إبراهيم، حدثنا يوسف بن إبراهيم، عن أبي الصباح، عن همام، عن كعب قال : (إن العبد ليذنب الذنب الصغير فيحقره ولا يندم عليه ولا يستغفر منه فيعظم عند الله حتى يكون مثل الطود، ويعمل الذنب العظيم فيندم عليه ويستغفر منه فيصغر عند الله حتى يغفر له) .

**٢٠٤** - كعب ئەڵێ : (بەندە تاوانێکی بچوک ئەنجام ئەدات، بە هیچی ئەزانێت، پەشیمان نابێتەوە لەسەری و داوای لێخۆش بوونی لەسەر ناکات گەورە ئەبێت لای الله تا بە وێنەی شاخێکی گەورەی لێ دێت، وە تاوانێکی گەورە ئەنجام ئەدات پەشیمان

ئەبێتەوە لەسەری و داوای لێخۆش بوونی لەسەر ئەكات بچووک ئەبێتەوە لای الله تا لێی خۆش ئەبێت ) .

**٢٠٥ - قال إبن أبي الدّنيا :وحدثنا محمد بن علي، عن أبي عبد الرحمن المقرئ، حدثنا حيوة بن شريح وابن لهيعة قالا : سمعنا يزيد بن أبي حبيب يقول : حدثني أبو عمران التجيبي، أنه** سمع أبا أيوب الأنصاري يقول : (إن الرجل ليعمل بالحسنة فيتكل عليها، ويعمل بالمحقرات حتى يأتي الله وقد أحطن به، وإن الرجل ليعمل بالسيئة فيفرق منها حتى يلقى الله آمناً.

**٢٠٥** - أبا أيوب الأنصاري ئەفەرمووێ : (پیاو هەیە كردەوەیەكی باش ئەنجام ئەدات و پاڵی لێئەداتەوە لەسەری، وە ئەوانە ئەنجام ئەدات كە بە هیچی ئەزانێت هەتا ئەگاتەوە بە الله بە هیلاكی ئەبات، وە پیاو هەیە خراپەیەک ئەنجام ئەدات خۆی لێ دوور ئەخاتەوە هەتا ئەگاتەوە بە الله بە ئەمینی ) .

والْحَمْدُ لِلّهِ رَبّ الْعَالَمِينَ

**الله عز و جل تۆبەی نەصوح بە نسیبی هەموومان بكات، آمين أجمعين**

https://t.me/ibnuabydunya